ناسنامەی کتێب
ناوی کتێب: چیرۆکە کاریگەرەکانی ژیان- بەرگی دووەم
ئامادەکردن و کۆکردنەوەی: محەمەدسالح پێندرۆیی (جگەرسۆز)
هەڵەگری و پێداچوونەوەی: ئامادەکار
دەرهێنانی هونەری: یعقوب قادر پیرۆت
بەرگ: ئاکار جەلیل
چاپی: یەکەم
نرخ: ٨٠٠٠ دینار
تیراژ: ٥٠٠ دانە
ساڵی: ٢٠١٧

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردن(٣٦١)ی ساڵی (٢٠١٧)ی پێدراوە

## ناوەرۆک

## دەستپێک

## بەناوی خودای مەزن و دڵۆڤان

بەڕێزان، هەر وەك ئاگادارن، بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە، بەناوی(چیرۆکە کاریگەرەکانی ژیان)، پێش چەند مانگێك هاتە چاپکردن و لەلایەن خوێنەرانەوە پێشوازییەکی گەرمی لێکرا. ئەوەی ئێستا لەبەردەستی ئێوەی ڕێزدار و خۆشەویستدایە، بەرگی دووەمی کتێبەکەیە، بەناوی (چیرۆکە کاریگەرەکانی ژیان).

ئەم بەرگە،(١٤٠)چیرۆکی هەمەڕەنگی فێرکاریی و پەروەردەیی لەخۆ گرتووە، لە کۆتایی هەر چیرۆك و بەسەرهاتێکیشدا، پەند و ئامۆژگارییە گرنگەکانی ئەو چیرۆکەمان خستووەتە ڕوو، بۆ ئەوەی تام و چێژێکی زیاتر بە خوێنەران ببەخشێت و سوودێکی زیاتریان پێ بگەیەنێت و دڵ و دەروونیان ئارام و ئاسوودەتر بکات.

هەروەها لەم بەرگەدا، لە کۆتایی هەر چیرۆکێك، دوو سێ بۆشاییمان جێهێشتووە، بۆ ئەوەی خوێنەری ئەم چیرۆکانە، وردتر بیر لە

کردەوە و گۆچانەکەی بە دەستەوە گرت، بۆ ئەوەی هەست بە ڕێگاکەی بکات، چونکە گەنجێکی نابینا بوو......

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ نابێ بە پەلە و، بەبێ وردبوونەوە و سەرنجدان، هیچ بڕیارێك بدات، چونکە بڕیاری بە پەلە، ئاکامێکی خراپی لێدەکەوێتەوە و ئەنجامەکەیشی پەشێمانییە.
- تا مرۆڤ نەچێتە بنج و بنەوانی کارێك، نابێ بە قسەی فلان و فیسار و ئەم و ئەو، هیچ هەنگاوێك بهاوێژێت.
- پێویستە مرۆڤ هەمیشە گومانی چاك بە خەڵك ببات، نەك خراپ، بۆ ئەوەی زۆرترین دۆست و کەمترین دوژمنی هەبێت.
- نابێ مرۆڤ هەڵە بە هەڵە چارەسەر بکات، بەڵکو دەبێ مرۆڤ هەڵەی بەرامبەر ڕاستکاتەوە.
- پێویستە دەستی یارمەتی و هاوکاری بۆ کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت درێژ بکەین، نەك بیان چەوسێنینەوە و ستەمیان لێ بکەین.
- ..........................................................
- ..........................................................
- ..........................................................

# چیرۆکی

## (٢)

## زینی ئەسپ

ڕۆژێك پێشەوا عەلی، هات بۆ مزگەوت، ئەسپێکی پێ بوو، کابرایەکی بینی لە نزیك مزگەوتەکە، پێی گوت: چاوێکت لەم ئەسپە بێت، تا نوێژەکەم دەکەم، کابراش ڕەزامەندی نیشان دا.

پێشەوا عەلی، چوو ناو مزگەوت، کابراش، بە پەڵە زینی ئەسپەکەی لێ کردەوە و بردی و لێی دا و بەرەو بازاڕ ڕۆیشت!!!

کاتێ پێشەوا عەلی لە مزگەوت هاتە دەرێ، دوو درهەمی لە دەست دابوو، بەنیاز بوو بیدات بەو کابرایە!!

بەڵام سەیری کرد، نە کابرا لەو ناوە ماوە، نە زینی ئەسپەکەیشی!!!

دواتر دوو درهەمی دایە کوڕەکەی و پێی گوت: برۆ بازاڕ، زینێکی دیکە بۆ ئەسپەکەم بکڕە.

کوڕەکەی چوو بازاڕ، هەمان زینی ئەسپی باوکی، بە دوو درهەم لەو کابرایە کڕییەوە، کە دزیبووی!!

دواتر پێشەوا عەلی فەرمووی: ئەو کابرایە خۆی بێبەش کرد لە دوو درهەمی حەڵاڵ و بە حەرامی بەدەستی هێنا و خۆی نەگرت، تا بە حەڵاڵی دەستی کەوێت.

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ دەبێ بە بەشی خۆی ڕازی بێت و چاوی لە ماڵی خەڵك نەبێت.
- ئەگەر کەسێك متمانەی پێکردین، دەبێ لە ئاست ئەو متمانەیە دابین و ئامانەت پارێز بین.
- مرۆڤی ژیر و بڕوادار، نابێ نانی حەڵاڵ، بە نانی حەرام بگۆڕێتەوە، چونکە نانی حەڵاڵ مایەی سەربەرزی و سەرفرازییە.
- ناپاکی کردن، هەم شەرمەزاری و ڕووڕەشی دونیای تێدایە، هەمیش قیامەت.
- مرۆڤ بە پاراستنی ئەمانەت، گەورە دەبێت و بە نەپاراستنیشی بچووك و ڕیسوا دەبێت.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٣)

## گەنجێکی دەستپاک

کەسێکی دەوڵەمەند، باخێکی گەورەی هەناری هەبوو، هەنارەکانی فرە رەنگ و هەمە جۆر بوون، پاسەوانێکی گەنجی بە کرێ گرتبوو، بۆ ئەوەی پاسەوانی باخەکەی بێت و ئاوی بدات و چاودێریی بکات!

پاسەوانە گەنجەکە، مرۆڤێکی زۆر دەستپاك و حەڵاڵ خۆر بوو، هەرگیز رۆژێك لە رۆژان بۆ تامکردنیش، دەستی بۆ هەنارەکانی خاوەن باخەکەی درێژ نەکردبوو!!!

رۆژێك، خاوەن باخەکە هاتە ناو باخەکەی و داوای لە پاسەوانەکەی کرد، کەوا چەند هەنارێکی شیرینی بۆ بچنێت، بۆ ئەوەی بیخوات!

ئەویش، چونکە پێشتر تامی نەکردبوون، نەیدەزانی کامەیان ترشە، کامەشیان شیرینە!

بۆیە هەندێك هەناری لە دارهەنارێك چنی و بردی لە پێش خاوەن باخەکەی دانا....

خاوەن باخەکەش، دەستی بۆ هەنارەکان برد و ویستی تامان بکات، بەڵام کە تامی کردن، هەنارەکان ترش بوون!!

بە پاسەوانەکەی گوت: ئەدی نەمگوت هەناری شیرینم بۆ بێنە؟!!!
بۆچی هی ترشت هیناوە؟!!!
ئەویش گوتی: قوربان ببۆرە، بە خوا لەو ڕۆژەوە کە هاتووم بۆ ئێرە، تا ئەمڕۆ، من تامی هەنارەکانتم نەکردووە، تاکو بزانم ئاخۆ ترشن یان شیرینن!!!!
خاوەن باخەکەش، بەم هەڵویستەی پاسەوانەکەی، تووشی شووك بوو!!! چونکە پێی سەیر بوو، گەنجێك، بە شەو و ڕۆژ لەناو باخەکەی دابێت و هێندە دەستپاك و لە خوا ترس بێت، دەست بۆ هەنارەکانی نەبات و نەیخوات!!!!
بۆیە کە زانی پاسەوانەکەی هێندە کەسێکی دەستپاك و ئەمینە، بڕیاری دا کچەکەی خۆی لێ مارە بکات و بیکاتە زاوای خۆی و بەو تەرزە پاداشتی بداتەوە!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- دەبێ چاکە، بە چاکە وەڵام بدرێتەوە.
- مرۆڤی دەستپاك، شایانی هەموو پاداشتێکە.
- ماڵی حەرام وەك ژەهر وایە، ژیان لە مرۆڤ دەکاتە ژان!!!
- کەسانی دەستپاك، لەسەر دەستی دایك و باوك و مامۆستا و ڕاهێنەرانی دەستپاك پەروەردە دەکرێن.

- بۆ ئەوەی مرۆڤ بە چاکی کەسێك بناسێت، یان دەبێ سەفەری لەگەڵدا بکات، یان کاری لەگەڵدا بکات، یان کڕین و فرۆشتنی لەگەڵدا بکات.
- پێویستە دایك و باوکەکان لە هەڵبژاردنی زاواکانیاندا وردبین بن و هانی کچەکانیان بدەن، بۆ ئەوەی کەسانی دەست و دڵپاك بۆ خۆیان هەڵبژێرن، تاکو لە ژیاندا ئاسوودە و بەختەوەر بن.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٤)

## دڵنیام باوکم دەمناسێتەوە

پیاوێك هەبوو، لە کانێکی خەڵوز کاری دەکرد، منداڵێکی هەبوو، منداڵەکەی زۆر خۆشدەویست.

ڕۆژێك منداڵەکەی، هەست بە غەریبی باوکی دەکات و سەردانی کانە خەڵوزەکە دەکات و حەز دەکات چاوی بە باوکی بکەوێت، سەرپەرشتیاری کانەکە، کاتێ منداڵەکە دەبینێ، پێی دەڵێ: ها ڕۆڵە خێرە بۆچی هاتوویت؟

منداڵەکە: غەریبی باوکم دەکەم، هاتووم باوکم ببینم!!!

سەرپەرشتیارەکە بە منداڵەکە دەڵێ: ڕۆڵەگیان، ژمارەیەکی زۆری کارگەرمان هەیە، سیما و ڕوخساریان تەپ و تۆزاوی و خەڵوزاوییە و هەمووان بە یەك دەچن!!! چۆن لەناو هەم هەموو کارگەرە دەتوانیت باوکت بناسیتەوە!!!

منداڵەکە یەکسەر وەڵامی سەرپەرشتیارەکەی دەیەوە: ڕاستە ئەستەمە من لەناو ئەم هەموو کارگەرانە، باوکم بناسمەوە، بەڵام دڵنیام ئەو دەمناسێتەوە!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- منداڵ زۆر وابەستەیە بە باوکییەوە، چونکە پشت و پەنایەکی گەورەیە بۆ ئەو، نەخاسمە لە قۆناغی سەرەتاییدا.
- زۆر ئەستەمە هیچ کەسێك لە ژیاندا بتوانێ شوێنی باوك بۆ منداڵ پڕکاتەوە، چونکە کە مرد، جارێکی دیکە دووبارە نابێتەوە.
- دەبێ باوك، دڵسۆز بێت بۆ منداڵەکانی، تاکو جێی متمانە بێت و لە دۆخە سەختەکاندا، پشتی پێ ببەستن.
- باوك لە چاوی منداڵەکانیدا زۆر گەورەیە، ئەگەر بە گوفتارە ناشیرینەکانی و بە کردارە قێزەونەکانی و بە ڕەفتارە پەستەکانی، خۆی بچووك نەکاتەوە.
- دەبێ باوك، هاوسەنگی نێوان ئەرك و مافەکاندا بپارێزێت و منداڵەکانی، نەکاتە قوربانی کارەکانی.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی

## (٥)

## جێگرەوەی پاشا

پاشایەك، هەستی کرد کەوا مەرگی نزیك بۆتەوە، بۆیە گوتی: دەبێ جێگرەوەیەك بۆ خۆم دابنێم، تاکو کاروباری وڵات بەڕێوە ببات!

پاشا گوتی: هەر کەسێك بتوانێ شەوێك لەو قەبرەدا بخەوێت، کە بۆ منیان ئامادە کردووە، دەبێتە جێگرەوەی من!!!

خزمەتکارەکانی پاشا، مەرجی پاشایان لەناو وڵاتدا بڵاوکردەوە..

هەژارێك گوتی: من بە مەرجی پاشا ڕازیم.

هەژارەکەیان هێنا و خستیانە ناو قەبرەوە و سەرەکەیان داپۆشی، بەڵام کونێکیان بۆ هێشتەوە تاکو هەناسە بدات و نەخنکێت!!

شەو، خەوی بینی، لە خەودا، دوو کەس هاتن بۆ لای و گوتیان: فلانی کوڕی فلان، تۆ لە دونیادا کەرێکت هەبوو، بەڵام بارێکی زۆرت لێ بار دەکرد و زۆر ئازارت دەدا و ئاو و جۆیەکی کەمیشت دەدایێ، بۆیە تا بەیانی تێیان هەڵدا..!!

بەیانی زوو بە حەپەساوی لە خەو هەڵسا!! خەڵکەکە هاتن، سەری قەبرەکە هەڵدەنەوە و، بە بەزم و شایی، پاشای تازە بەرنە سەر کورسیی پاشایەتی!!

بەڵام هەر کە سەری قەبرەکەیان هەڵدایەوە، کابرا هەڵهات!!!

خەڵکەکە کەوتنە شوێنی و بانگیان کرد: جەنابی پاشا بۆ ڕادەکەیت؟

وەرە بگەڕێوە، کابراش، کە لە خەودا حەپەسا بوو و زەندەقی چوو بوو!!!
گوتی من لەم دونیایە، تەنیا بەرپرسیارەتی کەرێکم لە ئەستۆ بوو، کەچی تا بەیانی تێیان هەڵدام، جا ئەگەر بەرپرسیارەتی میللەتێکم لەسەر شان بێت، چیم لێ دەکەن؟!!

نەخێر، من پاشایەتی ناکەم، پیرۆزی خۆتان بێت!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە**

- وەرگرتنی دەسەڵات، ئیمتیاز نییە، بەڵکو بەرپرسیارەتییە، بۆیە ئەوەی ئەمرۆ دەچێنی لە کاری چاکە، یان خراپە، بەیانی دەدوریتەوە!!!!
- ئەگەر مرۆڤ توانای ئەنجامدانی کارێکی نەبێت، نابێ خۆی لە قەرەی بدات و دەبێ لێی دوورکەوێتەوە و شوێنەکە بۆ کەسێکی شیاو بەجێبێڵێت..
- بەرپرسیارەتی، هەر تەنیا لەسەر شانی سەرۆکی وڵات و شار نییە، بەڵکو لەسەر شانی هەموو کەسێکە، هەر کەسێك، بەقەدەر ئەو دەسەڵاتەی کە هەیە، بەرپرسیارە لە کار و کردەوەکانی خۆی.
- ئەگەر بەباشی بیر لە ژیانی بەرزەخ بکەینەوە، سنووری خۆمان نابەزێنین.
- ...................................................
- ...................................................

# چیرۆكی

## (٦)

## خوایە گیان بمكە بە ئایپاد

مامۆستایەكی ئافرەت، لە وانەی دارِشتندا، داوای لە قوتابییەكانی كرد، كە لەسەر ئەم ناوو نیشانە دارِشتنێك بنووسن:(حەز دەكەیت ببیت بەچی)؟ قوتابییەكان دەستیان بە نووسینی دارِشتنەكە كرد.

مامۆستاكە، هەموو دارِشتنەكانی كۆكردەوە و بردییەوە ماڵەوە، بە شەو، دەستی پێكرد، یەكە بە یەكەی دارِشتنەكانی خوێندنەوە و نمرەی لەسەر دانا..

كاتێ گەیشتە دارِشتنی قوتابییەك و خوێندییەوە، بەدەستە خۆی نەبوو... زۆر خەمی خوارد وگریا....

هاوسەرەكەی پێی گوت: بۆچی دەگریت؟

مامۆستاكە گوتی: دارِشتنی قوتابییەك زۆر كاری تێكردم!!

هاوسەرەكەی گوتی: ئا دەی بخوێنەرەوە، حەز دەكەم بزانم چی نووسیوە، ئاوا بە كاریگەری دەزانیت!!!

مامۆستاكە دەستی كرد بە خوێندنەوەی دارِشتنی قوتابییەكە، كە نووسیبووی خوایە گیان! پرسیارم لێكراوە حەز دەكەیت ببیت بەچی؟ خوایە گیان، من حەز دەكەم ئەگەر بۆ شەوێكیش بێت، بمكەیت بە ئایپاد)!!!

چونكە دایك و باوكم هێندەی ئایپادیان خۆش دەوێت و لە باوەشی دەگرن و لەگەڵیدا دەبن و دێن و دەچن و ئاگاداری دەبن و خۆیان پێ سەرقاڵ

دەکەن، نیو هێندە لە باوەشم ناگرن و ئاوڕم لێنادەنەوە و منیان خۆش ناوێت!!!

خوایە گیان! وا بکە براکەم شەڕم لەگەڵدا بکات، چونکە ئەو لەبەر ئایپادەکەی، فریای ئەوە ناکەوێت قسەم لەگەڵدا بکات و تۆزێ پێکەوە یاری بکەین!!

خوایە گیان! داوای شتێکی زۆرم نەکردووە، تەنیا ئەوە نەبێت، ئەگەر بۆ شەوێکیش بێت، بمکەیت بە ئایپاد)!!!!!

هاوسەری مامۆستاکە گوتی: خەم مەخۆ! دایك و باوکی بێ هەست و بێئاگای لەو جۆرە زۆرە! منداڵەکانیانی پشتگوێ خستووە و فەرامۆش کردووە!!

مامۆستاکە گوتی: پیاوەکە، من بۆیە دەگریم، چونکە ئەو کوڕەی دارشتنەکەی نووسیوە، کوڕەکەی خۆمانە!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە**

- ئەگەر خانووی مرۆڤ لە شووشە بێت، نابێت بەرد بگرێتە ماڵی کەس.
- نابێ هیچ شتێك، ببێتە جێگرەوەی مرۆڤ، چونکە مرۆڤ جێنشینی خوایە لەسەر زەوی.
- پێویستە دایك و باوکەکان لە منداڵەکانی خۆیان غافل نەبن، بۆ ئەوەی نەکەونە تەڵە و هەڵەوە.
- باوکایەتی و دایکایەتی، بەرپرسیارەتییە، بۆیە دەبێ دایك و باوکەکان لە ئاست ئەو بەرپرسیارەتییە دابن.
- گرنگترین پێداویستی منداڵ، بریتییە لە خۆشەویستی دایە و بابە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

(٧)

## چاوبرسییەتی

جارێکیان پاشایەکی چینی، ویستی پاداشتی کابرایەکی جووتیار بداتەوە، چونکە لە کێڵگە و باخەکانیدا زۆر کاری کردبوو و ڕەنجی کێشابوو!

بۆیە پاشا بیری کردەوە و بانگی جووتیارەکەی کرد و گوتی: ئەی جووتیار، لە پاداشتی ئەوەی تۆ کارت بۆ من کردووە، منیش دەمەوێ بە چاکە پاداشتت بدەمەوە و خەلاتێکت پێ ببەخشم!

خەلاتەکەشم ئەوەیە: هەتا چەند ماوە(مەسافە) توانیت بڕویت، من ئەوەندە زەویت پێ دەبەخشم!!

کابرای جووتیار بەم هەواڵە شاگەشکە و خەنی بوو، بۆیە لە خۆشییان هێندە نەمابوو باڵبگرێت و بفڕێت!!

هەستا دەستی بە ڕۆیشتن کرد و ماوەیەك ڕۆیشت، وتی بەخوا تا ئێرە زەویم بداتێ زۆر باشە!

دواتر بیری کردەوە و گوتی نا، با هێشتان بڕۆم، تاکو زەویی زیاتر وەربگرم!!

ئەوەبوو بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، پاشان وەستا، ئینجا گوتی: نا..نا با هەندێکی دیکە بڕۆم، تاکو زەویی زیاتر وەربگرم!

ئیدی بەم شێوەیە، کابرا جار بەجار دەوەستا، بەڵام لە تەماحی وەرگرتنی ڕووبەرێکی زیاتری زەوی، لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو!!!!

تا وای لێهات کابرا ڕۆیشت و ئیدی بۆ هەتایە نەگەڕایەوە و گەشتەکەی، بە نەمانی ئەو کۆتایی هات!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە**

- چاوبرسییەتی و تەماح، سەری ساحیبی دەخوات!!
- دەبێ مرۆڤ سنووری خۆی بزانێت و سنووری خۆی نەبەزێنێت.
- ماڵی دونیا هێندە ناهێنێت کە مرۆڤ سەری خۆی لە پێناویدا دابنێت، چونکە ماڵ بۆ ئەوە دروست کراوە کە خزمەت بە مرۆڤ بکات، نەك مرۆڤ ببێتە خزمەکاری ماڵ و سامان.
- بەختەوەری بە هەبوونی زەوی و زار و ماڵی دونیا نییە، بە دڵتێری و قەناعەتە، بۆیە ئەگەر قەناعەتمان نەبێت، خۆمان ون دەکەین و ناگەین بە مەبەست.
- ..........................................
- ..........................................
- ..........................................

## چیرۆکی

## (٨)

## بەڕێوەبەرێکی نەزان

کەسێك وەك بەڕێوەبەری نوێی کارخانەیەك دەست بەکار دەبێت، ڕۆژێك بە مەبەستی بەسەرکردنەوەی کارگەر و فەرمانبەرانی کارخانەکە، سەردانی ئەو کارخانەیە دەکات و دوای چاکی و چۆنی کردن لەگەڵ کارگەر و فەرمانبەرانی ئەو کارخانەیە، گەنجێکی بینی لە پەنای دیوارێك پاڵی داوەتەوە و کار ناکات!

بەڕێوەبەرەکەش بە تووڕەییەوە لێی نزیك بووە و لێی پرسی: مووچەکەت چەندە؟ گەنجەکەش بە هێواشی وەڵامی دایەوە و گوتی: گەورەم نزیکەی ٥٠٠$ دۆلارێك دەبێت.

بەڕێوەبەرەکەش، بەبێ ئەوەی هیچ پرسیارێکی دیکەی لێ بکات، جزدانەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و ٥٠٠ دۆلاری ژمارد و دایە دەست ئەو گەنجە و پێی گوت، لێرە برۆ،گەنجەکەش لێیدا و ڕۆیشت و لە پێش چاوان ون بوو!!!!!!!!

ئینجا بەڕێوەبەرەکە، ڕووی کردە فەرمانبەر و کارگەرەکانی دیکە و پێی گوتن: ئەمە چارەنووسی هەر کارگەرێکە، کە کار نەکات!!! کەواتە چاك بزانن هەر کەسێ خۆی لە کار بدزێتەوە، گرێبەستەکەی هەڵدەوەشێنینەوە!!!

چونکـە مـن پـارە بـە کەسـێك دەدەم، کـە کـار بکـات، نـەك دانیشـێت و پاڵبداتەوە!!!!

ئینجا بەڕێوەبەرەکە خۆی گەیاندە یەکێك لە کارگەرەکان و پێی گوت: ئەو گەنجە کێ بوو کە دەرم کرد؟

کارگەرەکەش بە هێواشی پێی گوت: قوربان، ئەو فەرمابەری ئێرە نەبوو!! بەڵکو هاتبوو پیتزا بێنێت بۆ کارخانەکەمان!!!!!

بەڕێوەبەرەکـەش تـەزووی بـە لەشدا هـات و پەنجـەی پەشـێمانی گەسـت و زانی کەوا پەلەی کردووە و بڕیارێکی هەڵەی داوە، بەڵام ئیدی کار لە کار ترازا بوو!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ هیچ مرۆڤێك، بەتایبەتی بەرپرس و بڕیار بەدەستەکان، بە پەلە پەڵ و بەبێ بیرکردنەوە بڕیار بدەن.
- نابێ وەك ئەم بەڕێوەبەرە، مرۆڤ بڕیار لەسەر شتی ڕواڵەتی بدات، بەڵکو دەبێ جەوهەری شتەکان ببینێ و بچێتە بنج و بنەوانی کارەکان، ئینجا بڕیار لەسەر بابەتە گرنگەکان بدات.
- پێویستە مرۆڤ هۆکاری هەر هەڵەیەك بزانێت، بۆ ئەوەی نەکەوێتە هەڵە و تەڵەوە.
- پێویستە مرۆڤ، بەبێ پرس و ڕاوێژ، هیچ بڕیارێك نەدات و هیچ هەنگاوێك نەهاوێژێت.
- نابێ مرۆڤ هەڵە بە هەڵە چارەسەر بکات.

# چیرۆکی
## (٩)
## پیاوێکی دەوڵەمەند

لە زەمانی کۆندا، پیاوێکی دەوڵەمەند دووچاری نەخۆشییەکی کوشندە دەبێ، بۆیە لە ترسی مردن، خەڵکەکە کۆدەکاتەوە و دەڵێ:(خەڵکینە! نیوەی سامانەکەم دەدەمە ئەو کەسەی بتوانێ چارەسەرم بکات)!

هەموو زانا و حەکیمەکانی مەملکەت لە شوێنێك کۆبوونەوە، بۆ ئەوەی بزانن چۆن چارەسەری بکەن، بەڵام هیچ کامیان نەیانتوانی دەرمانی نەخۆشییەکەی بدۆزنەوە!

تەنیا زانایەك نەبێت، ئەو کەسێکی زۆر تێگەیشتوو و لێهاتوو بوو، گوتی "ئەگەر کەسێکی بەختەوەرم بۆ بدۆزنەوە، کراسەکەی بەری بێنن بیکەنە بەر دەوڵەوەندەکە، ئەوا چاك دەبێتەوە".

کوڕی ساماندارەکە، هەر زوو کەوتە گەڕان و سووڕان بە دوای کەسە بەختەوەرەکەدا.

سەرتاسەری وڵات گەڕا، یەك کەسی بەختەوەری نەدۆزییەوە! کە بە تەواوی لە ژیانی خۆی ڕازی بێت و خۆی بە بەختەوەر بزانێت.

ئەوەی سامانداربوو، نەخۆش بوو، ئەوەی سەلامەت بوو، لە ژیانی خۆی ناڕازی بوو! یان ئەگەر سامانداروسەلامەت بوایە، کێشە و گرفتی دیکەی هەبوو!

بەهەرحاڵ، هەر کەسێك گلە و گازاندەی خۆی هەبوو!!!!

لـە شـەوێکی تاریکـدا، کـوڕی سـامانداره‌کە بـە تـەنیش گـەڕەکێکی هەژارنشـیندا تێپـەڕی! گـوێی لـە کەسـێك بـوو لـە نـاو کەلاوەیەکـدا، دەی گوت: (خودایە سوپاسگوزاری تۆم، کاری خۆم تەواو کرد، تێر نانم خوارد، دەتوانم تێر بخەوم و ئیدی لەوە زیاتر هیچی دیکەم ناوێ).

کوڕەکە خەنی بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەمـە کەسـە بەختەوەرەکەیـە، بۆیە داوی کرد کراسی ئەو هەژارەی لێ بکڕن و هەر چی لە پارە و پووڵ و سـەروەت و سـامانی ویسـت، بیـدەنێ، بەشـکم بـاوکم بـە کراسـەکەی چـاك دەبێتەوە!

بەڵام کە چوون بۆ ماڵی ئەو هەژارە، تووشی شۆك بوون!

چونکـە ئـەو کەسـە هینـدە هـەژار بـوو، هـیچ کراسـێکی نـەبوو لەبـەری بکات!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- بەختـەوەری بە پارە و پووڵ و سـەروەت و سـامان نییـە، بە قەناعـەت و دڵفراوانییە.
- پارە و سامان ناتوانێ چارەسەری هەموو کێشەیەك بکات.
- بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی خۆمان، پێش ئەوەی ڕوو لە دەرەوە بکەین، دەبێ ڕوو لە ناخی خۆمان بکەین و بەختەوەری لـە نـاو نـاخی خۆمانـدا بدۆزینەوە.
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١٠)

## (پیرەژنێکی هەژار)

کەسێك بەم شێوەیە ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە و دەڵێت:" ڕۆژێك لای قەسابێك بووم، ژنێکی پیر هاتە ژوورەوە و لە گۆشەیەکەوە وەستا!

گەنجێکی جوانپۆشیش خۆی کرد بە ژوورەوە و بە قەسابەکەی گوت: کاك ئیبراهیم، ٥ کیلۆ گۆشتم بۆ بکێشە!

قەسابەکەش دەستی کرد بە کێشانی گۆشتەکە.

لەو میانەدا، ڕووی لە پیرە ژنەکە کرد و گوتی: دایەگیان تۆ چەند گۆشتت دەوێ؟

ئەو داماوە سەری کز کرد و بە دەستی لەرزۆکەوە، ٥٠٠ دینارەکەی دەرهێنا و دایە دەست قەسابەکە و گوتی: بایی ٥٠٠ دینارم بدەرێ! قەسابەکەش سەری سوڕما وگوتی: دایەگیان، ٥٠٠ دینار بەشی ئێسقانیش ناکات، چ جای گۆشت!!!

پیرەژنەکەش گوتی: قەیدی ناکات، ئێسقانیش بێت، بمدەرێ، سوپاست دەکەم!!!

قەسابەکە، ئێسقانەکانی ئەو گۆشتەی لێکردەوە کە بۆ گەنجەکەی دەکێشا...

کوڕە گەنجەکە لە کاتێکدا کە خەریکی یاریی کردن بوو لەگەڵ مۆبایلەکەی، ڕووی لە پیرەژنەکە کرد وگوتی: ئەو ئێسقانانە بۆ سەگەکەت دەبەیت؟

پیرە ژنەکەش، بەم قسەیە ڕەنگی تێکچوو و بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: سەگ!!!

گەنجەکە گوتی: بەلێ ئاخر سەگەکەم بە ئاسانی ئەو ئێسقانانە ناخوات! ئەی سەگی تۆ؟ دیارە زۆر بە قەناعەتە؟!!!!!

کوڕەکە بەردەوام بوو لە پرسیارکردن و ئەم جارە گوتی: سەگەکەت چ جۆرە سەگێکە؟!!!

پیرەژنەکەش، ڕەنگی سوورهەڵگەڕا و گوتی: تۆ باسی چی دەکەیت؟ ئەم ئێسقانانە بۆ منداڵەکانم دەبەم، بۆ ئەوەی شۆربای گۆشت بخۆن، چونکە دەمێکە گۆشتیان نەخواردووە و خەریکە لە برسا دەمرن!!!!

گەنجەکە بەم هەواڵە ڕەنگی تێکچوو.. بۆیە نیوەی گۆشتەکەی خستە سەر ئێسقانەکانی پیرەژنەکە، بەڵام پیرەژنەکە، ڕەتی کردەوە گۆشتی ئەو گەنجە لەخۆباییە، بۆ منداڵەکانی ببات، بۆیە ئێسقانەکانی هەڵگرت و بە دڵێکی شکاوەوە دوکانەکەی جێهێشت!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- ئەی دەوڵەمەند و سەرمایەدارەکان، هەرگیز وا مەزانن کەگیرفانی هەموو خەڵکی وەك گیرفانی ئێوە پڕە لە پارە.
- ئەگەر گوڵ نیت، دڕکیش مەبە.
- قەت بە پارە و پووڵ خۆت هەڵمەکێشە و لەخۆبایی مەبە، چونکە چەند سەرمایەت هەبێت ناگاتە گەنجینەکانی قاروون، کەچی بە خۆی و گەنجینەکانی بە زەویدا چوو خوارێ و نغرۆ بوو!!!!
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١١)

## له دەرگای کێ بدەیت، له دەرگات دەدرێتەوە

پیاوێکی زێڕینگری پارسا و له خواترس له بەغدا دەژیا، هاوسەرێکی تا بڵێی بڕوادار و داوێنپاکی هەبوو..

ئەو ژن و پیاوە لەگەڵ یەکتری ساز و تەبا بووبن و هیچ کێشە و گرفتێکیان لەگەڵ خزم و جیرانەکانیان نەبوو، بۆیە زۆر بە خۆشی و شادی، ژیانی خۆیان دەگوزەراند!!

زێڕینگرەکە، خزمەتکارێکی دەستپاکی هەبوو، هەموو ڕۆژێ ئاوی بۆ دەهێنایە ماڵەوە!!

پیاوەکەش، ڕۆژانە دەچوو دوکانێ و کار و کەسابەتێکی حەڵاڵی دەکرد، بەبێ ئەوەی بە چاوی ناپاکی، سەیری ئافرەتانی نامەحرەم بکات!!!

ڕۆژێك خزمەتکارەکە هاتە بەر دەرگای ماڵی زێڕینگرەکە و لە دەرگای دا، ژنی زێڕینگرەکەش دەرگای کردەوە، بۆ ئەوەی ئاوەکەی لێ وەربگرێت، بەڵام ئەو ڕۆژە، ئەوەی کە ژنەکە بە خەیاڵیدا نەهاتبوو، ڕوویدا!!

چونکە خزمەتکارەکەیان یەکسەر پەلاماری دا و، دەستە جوان و سپییەکانی گرت، ئینجا بەری دا و ڕۆیشت!!!!

ژنی زێڕینگرەکەش، بەو کارە ناشیرینە زۆر زۆر بێ تاقەت بوو! بۆیە چاوەڕێ بوو، تا پیاوەکەی هاتەوە. کاتێ هاتەوە، ژنەکەی لێی پرسی:

پیاوەکە، تۆ خوا.. تۆ خوا، ڕاستیم پێ بێژە: ئەمڕۆ چ تاوانێکت ئەنجام داوە و چ کارێکی خراپ کردووە؟

ئەویش سەرەتا ویستی بیشارێتەوە، بەڵام دواتر ڕاستییەکەی درکاند و گوتی: ژنەکە بەخوا ئەمڕۆ کچێکی گەنجی جوان هاتە دوکانێ، دەستەکانی وەك بەفر سپی بوون، بۆیە خۆم پێ ڕانەگیرا و دەستەکانی ئەو کچەم گرت!!!

ژنەکەی گوتی: پیاوەکە، با بەسەرهاتی خۆم و خزمەتکارەکەمانت پێ بڵێم: ئەمڕۆ خزمەتکارەکەمان هات و لەناکاو! دەستی بۆ هێنام و دەستی گرتم!!!

بەخوا ئەگەر تۆ شتی زیاترت بکردایە، ئەویش شتی زیاتری دەکرد!!!!

بۆیە پشت لە شەیتان و ڕوو لە خوا بکە!!!

پیاوەکەش هەستی بە تاوانی خۆی کرد و لە کارە ناشیرینەکەی پەشێمان بووە و بەڵێنی بە خوا و هاوسەرەکەی دا، کە ئەو جۆرە کارە ناشیرینانە دووبارە نەکاتەوە، چونکە بۆی دەرکەوت، کە لە دەرگای کێ بدات، لە دەرگای دەدرێتەوە!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ چی بچێنێت، ئەوە دەدورێتەوە.
- دەبێ مرۆڤ لەگەڵ خوای خۆی ڕاستگۆ بێت، چونکە پەنا بە خوا، فێڵ لە خوا ناکرێت.
- هەر وەك چۆن مرۆڤ پارێزگاری لە شەرەف و نامووسی خۆی دەکات، دەبێ ئاوا پارێزگاری لە شەرەف و نامووسی خەڵکی دیکەش بکات.
- مرۆڤ بە ڕاستگۆیی بەرزە دەبێتەوە، بە درۆکردنیش نزم دەبێتەوە.
- ئەو کەسەی تاوانێك دەکات، زوو یان درەنگ، دەبێ سزایەکەی وەربگرێتەوە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی
## (١٢)
## تیدی

ڕۆژێکیان مامۆستایەکی قوناغی بنەڕەتی، ڕۆیشتە پۆلی پێنج و بە قوتابییەکانی گوت: هەمووتانم خۆش دەوێت، بەڵام لە دڵی خۆیدا گوتی تەنیا یەك قوتابی نەبێت، ئەویش(تیدی)یە!

چونکە جلەکانی تیدی، زۆر ناڕێك و چڵکن و پیس بوون، لە خوێندیشدا قوتابییەکی تەمبەڵ و تەوەزەڵ بوو!!

مامۆستاکەی، زۆر لە هەڵسوکەوتی بێزار بوو و زۆر بە خراپی سەیری دەکرد.

کاتێ نمرەی بۆ قوتابییەکانی دادەنا، هەمیشە بەشی تیدی سفر بوو، بۆیە لەسەر وەرەقەکەی دەنووسی ساقیت!!!!

ڕۆژێك بەڕێوەبەری قوتابخانە داوای لەو مامۆستایە کرد، کە سەیری نمرەکانی قوتابییەکانی بکات لە ساڵانی ڕابردوودا، مامۆستاکەش، کاتێ تۆماری نمرەکانی(تیدی)ی خوێندەوە، تووشی شۆك بوو!!

مامۆستای پۆلی یەکەمی تیدی، نووسیبووی: تیدی قوتابییەکی زۆر زیرەکە و ئەرکەکانی خۆی زۆر بە جوانی جێبەجێ دەکات!!

مامۆستای پۆلی دووەمی تیدی، نووسیبووی: تیدی قوتابییەکی زیرەك و خۆشەویستە، بەڵام بێ تاقەتە، چونکە دایکی نەخۆشە و دووچاری شێرپەنجە بووە!

مامۆستای پۆلی سێیەمی تیدی، نووسیبووی: مردنی دایکی تیدی، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر تیدی هەبوو، هەرچەند هەوڵی خۆی دەدات، بەڵام باوکی هاوکاری ناکات، بۆیە ئاستی دابەزیوە و پێویستی بە هاوکارییە!!

مامۆستای پۆلی چوارەمی تیدی، نووسیبووی: تیدی قوتابییەکی تەمبەڵە و ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ ناکات!!

کاتێ مامۆستا گەیشتە ئێرە، زۆر هەستی بە شەرمەزاری کرد و زانی هەمبەر تیدی کەمتەرخەمی کردووە، چونکە هەقیقەتەکەی بۆ دەرکەوت!

ڕۆژی دواتر، قوتابییەکان، هەر یەکە دیارییەکی جوانی بۆ مامۆستا هێنا بوو و خستبوویانە ناو بەرگێکی جوانەوە، بەڵام تیدی، دیارییەکەی خستبووە ناو مقەبای بەقاڵەوە و دیارییەکەیشی بریتی بوو لە عەترێك، کە کەمێکی تێدا مابوو!!!! لەگەڵ ئەڵقەیەکی شکاو!!

کاتێ مامۆستا، دیارییەکەی (تیدی)ی کردەوە، هەموو قوتابیان دەستیان بە پێکەنین کرد!! بەڵام مامۆستا لێیان تووڕە بوو و گوتی: دیاریی تیدی، لە گشت دیارییەکانی ئێوە بەنرخ ترە.

لە پێش چاوی قوتابیان، عەترەکەی لە خۆی دا و ئەڵقە شکاوەکەیشی کردەی دەستی و زۆر سوپاسی تیدی کرد!!!

ئـەو ڕۆژە، تیـدی لـە دەرەوە چـاوەڕێی مامۆسـتاکەی دەکـرد، کـاتێ مامۆسـتاکەی هـات! بـە پیریـەوە چـوو و بـە مامۆسـتاکەی گـوت: مامۆستاگیان ئەمڕۆ من زۆر دڵخۆشم، چونکە بۆنی عەتری دایکم لە تۆ دێت، لـەو کاتـەوە مامۆسـتا، دەسـتی بـە گریـان کـرد و بـەڵێنی پێـدا کـە لەمەودوا زۆر هاوکاری تیدی بکات، بۆ ئەوەی لە وانەکانی سەرکەوتوو بێت.

تیـدیش بـەم ڕەفتـارەی مامۆسـتا زۆر دڵخـۆش بـوو و ڕۆژ بـە ڕۆژ زیرەکتر دەبوو، تاکو بوو بە زیرەکی پۆل.

لـە کۆتـایی سـاڵدا، مامۆسـتاکە نامەیـەکی تیـدی بینـی، کـە لـە پـێش دەرگای ماڵەکەیان دانابوو، تێیدا نووسیبووی: (مامۆستاگیان، بەڕاستی تۆ باشـترین مامۆسـتامی)!! مامۆستایەکەیشـی لـە وەڵامـی نامەکەیـدا بـۆی نووسیبوو: (تیدی گیان! تۆ فێرت کردم کە ببم بە باشترین مامۆستا))!

دوای چەنـــد ســـاڵێك، مامۆســـتاکەی، لەلایـــەن (تیـــدی)یـــەوە، بانگهێشتنامەیەکی بۆ هات، بۆ ئەوەی ئامادەبێت لە ئاهەنگی دەرچوونی ئەو، لە کۆلیژی پزیشکی!!!!

مامۆستاکەی، پێش ئەوەی بڕوات، عـەتری (تیـدی)ی لـە خۆدا، هـەروەها ئەو ئەڵقەشی کردە پەنجەی خۆی، کە کاتی خۆی بە دیاری بۆی هێنابوو!!!

کاتێ گەیشتە شوێنی ئاهەنگەکە، تیـدی بەخێرهاتنێکی گـەرمی کـرد و گوتی بەخێر بێیت دایە گیان!!

ئایا دەزانن تیدی کێیە؟

تیدی ستودارد، یەکێکە لـە بـەناوبانگترین پزیشـکەکانی جیهـان و خـاوەنی سەنتەری(ستودارد)ە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکانی شێرپەنجە!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هەر کێشە وگرفتێك، هۆکارێکی هەیە، بۆیە ئەگەر بمانەوێ دەردەکان دەرمان بکەین و زامەکان سارێژ بکەین و کێشەکان چارەسەر بکەین، دەبێ بەدوای هۆکارەکاندا بگەڕێین و بیان دۆزینەوە.
- نابێ لەسەر هەڵەیەك، کەسایەتی هیچ کەسێك بێتە تێکشکاندن!
- چەندە سەرکۆنەکردن و سەرزەنشتکردن، دەبێتە هۆی ڕووخاندنی مرۆڤ، هێندەش هاندان و پاڵپشتیکردن، دەبێتە هۆی هەستانەوە و سەرکەوتنی مرۆڤ لە ژیاندا.
- مرۆڤی ژیر، ئەوەیە بتوانێ واقع وەك خۆی بخوێنێتەوە.
- نابێ مرۆڤ حوکم لەسەر ڕواڵەت بدات، بەڵکو دەبێتە بچێتە ناو جەوهەری شتەکان.
- زۆرجار، ڕەفتار و هەڵسوکەوتی جوانی مامۆستایەك لەگەڵ قوتابی، دەبێتە خاڵی وەرچەرخان بۆ سەرکەوتنی ئەو قوتابییە لە گشت کایەکانی ژیاندا، بەپێچەوانەشەوە، زۆر جار هەڵەیەکی مامۆستا، ڕەنگە ببێتە هۆکاری وازهێنانی قوتابی لە قوتابخانە و مردنی توانا و بەهرەکانی.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

# چیرۆکی

## (١٣)

## خۆشباوەری(ساویلکەیی)

پیاوێك بە بیابانێکدا دەڕۆیشت، بەردێکی گەورەی بینی، نیوەی لە لمەکە چەقیبوو!!!

لە بەردەکەی نزیك بووە و بینی نووسینێك لەسەری نووسراوە، تۆزەکەی بە لەپی دەستی لەسەری لابرد و بە سەرسوڕمانییەوە نووسینەکەی خوێندەوە:(هەڵمگێڕەوە، تا دەوڵەمەندت بکەم)!!!!!!!

پیاوەکە یەکسەر خەیاڵی بۆ ئەوە چوو، کە گەنجینەیەك لە ژێر ئەم بەردەدا هەبێت!

بۆیە هەر زوو دەستی کرد بە هەڵگەڕاندنەوەی بەردەکە، پاش چەند کاتژمێرێك و دوای هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر، توانی بەردەکە هەڵگەڕێنێتەوە!!!

بەڵام تووشی نائومێدی بوو!!!

چونکی هیچی نەدۆزییەوە، تەنیا نووسینێك نەبێت، کە لەسەری نووسیبوو:(وەك جارانم لێبکەوە، بۆ ئەوەی گێلێکی دیکە هەڵخەڵەتێنم)!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤی ژیر و هۆشمەند، نابێ بە مستێك ئاو مەلە بکات و هێندە خۆشباوەر بێت، بە هەموو شتێك باوەڕ بکات.
- مرۆڤ نابێ بە دروشمی بریقەدار هەڵبخەڵەتێت.
- نابێ دوو جار لەسەر یەك فێڵ لە مرۆڤ بکرێت.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی

## (١٤)

## دەمەوێ خۆم بم

لـە باخچـەی شـێتخانەیەکدا پیاسـەم دەکـرد! بیـنم گـەنجێك خـەریکی خوێندنەوەی کتێبی فەلسەفەیە، منیش سڵاوێکم لێکرد و وا هەستم کرد کە وەك ئەوانی دیکە شێت نییـە! بۆیـە لـە تەنیشـتییەوە دانیشـتم و لـێم پرسـی:" لێرە چی دەکەیت"؟!!!

بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی کردم، بەڵام کە زانی پزیشك نیم، وەڵامی دامـەوە و گـوتی:" ئاسـاییە لێـرەم، بـاوکم نوێنـەری کۆمپانیایـەکی باشـە، دەیویست منیش بە ڕێگـەی ئەودا بڕوم!!، مامیشم خاوەنی کۆمپانیایەکی بازرگانییە، ئەویش حەزی دەکرد وەك ئەو ببم بە سـەرمایەدار، دایکیشم پێی خۆش بوو، وەك باوکم بم!!!!

خوشکیشـم، هاوسـەرەکەی، پیـاوێکی نموونەییـە، ئـەویش حـەزی دەکـرد براکەی وەك پیاوی بێت!!!

براکەشم دەیویست بە جۆرێك پەروەردەم بکات، کە وەك ئەو وەرزشـکارێکی سەرکەوتوو بم.

ئەو بەردەوام بـوو لەسـەر گێڕانـەوەی بەسەرهاتەکانی خۆی، مـنیش گـوێم بۆ شل کردبوو، حەزم دەکرد بزانم ئەم بەسەرهاتە بەچی دەگات!!!

لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: لە قوتابخانەش، مامۆستای هونەر و زمان، پێیان وابوو، کە باشترین مامۆستان و دەبێ چاو لەوان بکەم و ببم بە کۆپی ئەوان.

لە ڕاستیدا، هیچ کامیان بەو جۆرە سەیری منیان نەدەکرد کە مرۆڤێکی دیکەم و خەونەکانم لە خەونی ئەوان ناچێت، هەمووان وا سەیری منیان دەکرد کە دەبێ وەك خۆیان بم، بۆیە هاتم بۆ شێتخانە، چونکە ئێرە شوێنێکی ئارامە و کەسیش ناتوانێ ناچارت بکات، کە وەك ئەو بیت، بەڵکو من دەتوانم لەم شوێنەدا خۆم بم!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نەك مرۆڤەکان، بگرە پەنجەکانی دەستیش وەك یەك نین، بۆیە دەبێ یەکتری قبووڵ کەین بە جیاوازییەکانیشمانەوە.
- نابێ مرۆڤ لە ژیاندا خۆسەپێنەر و دیکتاتۆر بێت، چونکە هیچی لێ سەوز نابێت.
- پێویستە مرۆڤ ڕێز لە جیاوازییەکان و جیاتاکییەکان بگرێت.
- هەر کەسێك سنووری خۆی هەیە، مرۆڤ تا ئەو شوێنە ئازادە کە سنووری کەسێکی دیکەی نەبەزاندبێت.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی

## (١٥)

## دابەشکردنی عەقڵ و ڕەوشت

لە ناو جەرگەی بازاڕدا، پیاوێك و ژنێك بۆ بە دەمەقاڵێیان، پیاوەکە بێ شەرمانە بە ژنەکەی گوت: کاتێ عەقڵیان دابەش کرد، تۆ لە کوێ بوویت؟ !!!!

ژنەکەش گوتی: من خەریکی دابەشکردنی ڕەوشت بووم، بەڵام تۆم لەوێ نەدیت!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ جیاوازی بیرو ڕا، یان ڕاجیایی، ببێتە هۆکارێك بۆ یەکتر شکاندن.
- هەڵە بە هەڵە چارەسەر ناکرێت، بۆیە مرۆڤی ژیر، هەڵە بە چاکە ڕاستدەکاتەوە.
- پێویستە مرۆڤ سنووری خۆی نەبەزێنێت، چونکە هەر کارێك کاردانەوەیەکی هەیە.
- تا بکرێت مرۆڤ دەمەقاڵێ و جەدەڵ نەکات، چونکە جگە لە بوغز و قین و ناخۆشی و دووبەرەکی، هیچی دیکەی لێ سەوز نابێت.
- ئەرکی زمان بریندارکردنی هەستی خەڵك نییە.

## چیرۆکی

### (١٦)

## دایکێکی درۆزن و زڕدایکێکی ڕاستگۆ

منداڵەکە هێشتان تەمەنی هەشت ساڵ بوو، کە دایکی مرد!!!

دواتر باوکی، ژنێکی دیکەی هێنایەوە، ڕۆژێك لە کوڕەکەی پرسی:

جیاوازی چییە لە نێوان دایکی مردووت لەگەڵ دایکی ئێستات؟

منداڵەکەش بە دڵسافییەوە وەڵامی دایەوە: دایکە ڕاستەقینەکەم درۆی لەگەڵ دەکردم، بەڵام ئەم دایکە نوێیەم ڕاستگۆیە لە قسەکانیدا.

باوکی سەری سوڕما وگوتی: دەتوانی بۆم بسەلمێنی؟

منداڵەکە گوتی: کاتێ یاریم دەکرد و دایکم تووڕە دەبوو، دەیگوت: ئەگەر بە گوێم نەکەیت و زوو نەگەڕێیتەوە ماڵەوە، نانت نادەمێ.

بەڵام لەسەر قسەی خۆی نەبوو، کۆڵان بە کۆڵان بە دوامدا دەگەڕا، تا دەیهێنامەوە بۆ ماڵەوە، دواتر نانی پێ دەدام!!!

بەڵام ئێستا، کاتێ یاریی دەکەم، دایکە نوێیەکەم دەڵێ: ئەگەر زوو لە یاریکردن نەگەڕێیتەوە ماڵەوە، نانت نادەمێ!!

وا لە دوێنێ وە نانم نەخواردووە!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- بەڕاستی هیچ کەسێك ناتوانێ کەلێنی دایك پڕکاتەوە و ببێتە جێگرەوەی ئەو.
- باوك لە ماڵەوە بەرپرسی یەکەمە، بۆیە دەبێ بزانێ لە ماڵەوە چی دەگوزەرێ!!
- منداڵ، وەك کاغەزی سپی وایە، بۆیە وەك گەورەکان شتی شاراوە نازانێ و هەمیشە شتی بن بەڕێ، دێنێتە سەر بەڕێ!!!
- زڕدایکەکان بە دڵڕەق ناسراون، بۆیە دەبێ بەخۆیاندا بچنەوە و بزانن ئەوەی ئەمڕۆ دەچێنن، بەیانی دەچننەوە!!!
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١٧)

# ژیری بە گەورەیی و بچووکی نییە

لە یەکێك لە دێهاتەکان، دایکێك لەگەڵ منداڵە بچووکەکەی، ویستی بەرەو شار بچێت، بۆیە سواری بارهەڵگرێك دەبن، لە ڕێ، بارهەڵگرەکە لە ناو تۆنێلێك عاسێ دەبێ، شۆفێری بارهەڵگرەکە چەندی بیری کردەوە، نەیزانی چۆن لە تۆنێلەکە ڕزگاری بێت!!!

ناچار، دێتە خوارەوە و بیر لەوە دەکاتەوە بارەکەی بێنێتە خوارەوە، تاکو لەو کێشەیە ڕزگاری بێت.

بەڵام ئەو منداڵە بچووکەی کە لەگەڵ دایکی دابوو، بیرۆکەیەکی بۆ هات و گوتی: دایە...دایە، ڕێیەکی ئاسانترم بە خەیاڵدا هات! ئەگەر کاری پێ بکرێت ئەوا پێویست بەوە ناکات باری بارهەڵگرەکە بیهێنینە خوارەوە!!!

بەڵام دایکی منداڵەکە گوێی پێ نەدا.. چەند جارێك دووبارەی کردەوە، کەچی سوودی نەبوو!! ناچار ڕۆیشتە لای شۆفێری بارهەڵگرەکە وگوتی: ئەگەر تۆزێك هەوا لە تایەکانی بارهەڵگرەکەت دەربێنی، تۆزێك نەوی دەبێت و لەم کێشەیە ڕزگارت دەبێت.

شۆفێرەکەش، بە بیرۆکەی ئەو منداڵە سەرسام دەبێ!! بۆیە یەکسەر بە گوێی دەکات و لەو کێشە وگرفتە ڕزگاری دەبێ!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- ژیـری بـە گـەورەیی و بچـووکی نییـە، بۆیـە نـابێ گـەورەکان، ڕا و بۆچوونی بچووکەکان پشتگوێ بخەن.
- هـیچ کێشـەیەك بـێ چارەسـەر نییـە، بـەڵام پێویسـتە بـە دوای چارەسەرێکدا بگەڕێین، کە ئاسانتر و خێراتر بێت.
- گرێیەك کە بە دەست بکرێتەوە، نابێ بە ددان بیکەینەوە.
- ..........................................
- ..........................................
- ..........................................

## چیرۆکی

## (١٨)

## بڕیارێکی هەڵە

خاوەنی کۆمپانیایەکی بیناسازی، چوار کرێکار دەبات بۆ ئیش، سێ لەو کرێکارانە، کەسانی تەمبەڵ و ساختەچی بوون، بۆیە هەر کە خاوەنکار دەڕۆیشت و لە پێش چاو ون دەبوو، ئەو سێ کرێکارە ساختەچییە پاڵیان دەدایەوە و بە نۆبەت لێی دەنووستن!!

هەر کاتێ بشیان زانبوایە کە خاوەنکار دێتە سەر کاری خۆی، ئەوا گورج و گوڵ و توندوتوڵ هەڵدەستان کاریان دەکرد و وایان نیشان دەدا، کە لە کار و کەسابەتدا، کەس ناتوانێ شان لە شانی ئەوان بدات!!!!

هەرچی کەسی چوارەم بوو، کەسێکی تا بڵێی نان حەڵاڵ و دەستپاك و ڕەنجکێش بوو! هیچ فرت و فێڵێکی نەدەزانی، بۆیە خاوەنکار لەوێ بوایە یان لەوێ نەبوایە، ئەو هەر بە ڕێکوپێکی ئیشی خۆی دەکرد!!!

ڕۆژێکیان، ئەو کرێکارە هێندە کاری کردبوو، بێ ئەندازە شەکەت و ماندوو بوو! بۆیە ویستی پشوویەك بدات و کەمێك بحەسێتەوە، بەڵام زۆری پێ نەچوو، خاوەنکارەکە هات و بینی یەکێك لە کرێکارەکانی ڕاکشاوە و پاڵیدایتەوە!!

خێرا ڕۆیشت بۆ لای و لێی پرسی: خێرە خەوتووی؟!!!

ئەویش گوتی: قوربان زۆر شەکەت و ماندووم!!!

خاوەنکارەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: باشە ساختەچی، شەرت بێت، کۆتا ڕۆژت بێت!!!
ئێوارێ، کاتی دەستهەڵگرتن لە کار، خاوەنکارەکە پارەی کرێکارەکانی دایە دەستیان و بە کرێکارە ڕەنجکێش و نان حەڵاڵەکەشی گوت: ئەمڕۆ کۆتا ڕۆژتە، لە بەیانییەوە نابێ بێیتەوە سەر کار، چونکە کرێکارێکم ناوێ بێتە ئێرە پاڵداتە!!

پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:

- نابێ مرۆڤ تفەنگ بە تاریکییەوە بنێت!
- دەبێ بەڕێوەبەر، هێندە وشیار بێت، فێڵی لێنەکرێت و دەستخەڕۆ نەکرێت.
- نابێ مرۆڤی ژێر حوکم لەسەر ڕواڵەت بدات، بەڵکو پێویستە لە کارەکانیدا وردبین بێت و بتوانێ کەسەکان بخوێنێتەوە، ئینجا بڕیار لەبارەیانەوە بدات...
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی
## (١٩)
## سێ گەنجی فشەکەر

سێ گەنجی فشەکەر، ڕاهاتبوون هەموو ڕۆژێ دەچوونە چایخانەیەك، فشەیان بە چایچی چایخانەکە دەکرد!!!

ڕۆژێك بڕیاریاندا چیتر فشە بەو کابرایە نەکەنەوە!

بۆیە هەستان چوونە لای چایچییەکە و پێیان گوت: لەمڕۆ بەدواوە بڕیارمان داوە پێت ڕانەبوێرین و فشە و گاڵتەت پێ نەکەینەوە!!!!

کابرای چایچیش گوتی: مادام ئێوە هێندە پیاون، منیش چیتر چڵکاوی ژێر پیالەکان دەرخواردتان نادەم!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هەر کارێك، کاردانەوەیەکی هەیە، بۆیە دەبێ مرۆڤ کاری چاکە ئەنجام بدات، بۆ ئەوەی کاردانەوەکەیشی ئەرێنی بێت و سوودی هەبێت نەك زیان.
- نابێ مرۆڤ هەر خۆی پێ زانا بێت و پێی وابێت خەڵکی دیکە گێڵ و نەفامە، چونکە زۆر جار ئەمە پێچەوانە دەبێتەوە، هەر وەك ئەم بەسەرهاتە.
- نابێ مرۆڤ هەستی هیچ کەسێك بریندار بکات.

# چیرۆکی

## (٢٠)

## شوانێکی دەستپاک

جارێکیان چەند ڕێبوارێك، کە برسییێتی زۆری بۆ هێنابوون، لە ڕێگەدا شوانێکیان بینی، خەریکی لەوەڕاندنی مەڕەکان بوو. بە بینینی شوانەکە خەنی بوون، بۆیە بە دەرفەتیان زانی داوای لێ بکەن کە مەڕێکیان پێ بفرۆشێت، بۆ ئەوەی سەری ببڕن و لە برسییێتی ڕزگاریان بێت.

هەستان چوونە لای شوانەکە و دوای سڵاو و چاکی و چۆنی.. گوتیان: تکایە مەڕێکمان پێ بفرۆشە، برسییێتی زۆری بۆ هێناوین!!

شوانەکە گوتی: ببۆرن، من شوانم، خاوەنی مەڕەکان نیم!!

هەر بۆیە لە دەسەڵاتم دا نییە مەڕەکان بفرۆشم!!!

ڕێبوارەکان گوتیان: قەیدی ناکات! مەڕێکمان پێ بفرۆشە و پارەکەیشی بیخەرە گیرفانتەوە، خۆ کەس لێرە ناتبینێت و کەسیش پێی نازانێت، کاتێ گەڕایەوە ئاوایی، بە خاوەن مەڕەکان بڵێ: گورگ خواردی!!!

شوانەکە گوتی: ڕاستە ئێستا خاوەنی مەڕەکان لێرە نییە، بەڵام (خوا)ی خاوەنی مەڕەکان لێرەیە و دەمبینێت و دەزانێ، بۆیە لە ترسی خوا، ناپاکی لە خاوەن مەڕەکان ناکەم و خۆم ڕووڕەش و شەرمەزاری دونیا و قیامەت ناکەم!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە**

- نابێ ماڵی دونیا، خوامان لە بیر بباتەوە.
- دەبێ مرۆڤ لە کارەکانیدا دەستپاك بێت و هەرگیز توخنی ناپاکی نەکەوێت.
- مرۆڤی دەستپاك، هەم لای خودا، هەمیش لای خەڵکی، ڕێزدار و خۆشەویستە.
- نابێ بۆ پارە و پووڵ و سەروەت و سامان، مرۆڤ فێڵ لە خۆی بکات و ناپاکی لە ئەمانەت بکات.
- پێویستە مرۆڤ لە ژیاندا هەمیشە ڕاستگۆ بێت و پەنا نەباتە بەر درۆ کردن.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٢١)

## شێر و خەت

لە ژاپۆن(یابان)، سوپا سالارێك هەبوو، پێش دەستپێکردنی شەڕ، پارچەیەك دراوی ئاسنی هەڵدەدایە سەرزەوی، ئەگەر شێر بوایە، دەیگوت: (سەردەکەوین)، بەڵام ئەگەر ڕووی پارەکە(خەت)بوایە، دەیگوت: دەیدۆڕێنین!!!

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو، هەموو جارێ ڕووی پارەکە شێر دەبوو. سەربازەکانیش، هەموو جارێ بە گیانی سەرکەوتنەوە دەچوونە بەرەکانی جەنگ و دواتر لە شەڕەکاندا سەردەکەوتن و شکستیان بە دوژمنەکانیان دەهێنا.

لە جەنگەکی گەورەدا، پێش ئەوەی هێرش بکەنە سەر دوژمن، سوپا سالارەکە دراوەکەی دەرهێنا و هەڵیدایە سەر زەوی، وەك جاران شێر دەرچوو، هەموو سەربازەکان گوتیان: سەردەکەوین...سەردەکەوین...سەردەکەوین!!!!!

کە چوونە گۆڕەپانی جەنگەکە، سەرکەوتنیان بەدەست هێنا وگەڕانەوە نیشتمان.

یەکێك لە ئەفسەرە گەورەکانی سوپا، بە سوپا سالارەکەی گوت: قوربان! چۆن دەبێت چارەنووسی سوپایەك، بە پارچە دراوێك بسپێریت؟

سوپا سالارەکەش گوتی: ئەوەی ڕاستی بێت، هەردوو لای دراوەکە شێرە!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- گەورەترین هێز، هێزی باوەڕ و ئیرادەیە، بۆیە هەمیشە هێزی ئیرادە بەسەر هێزەکانی دیکەدا سەردەکەوێت.
- سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی هەر لەشکرێك، تا ئەندازەیەکی زۆر پەیوەستە بە سەرۆکەوە، ئەگەر سەرۆك، کەسێکی ورەبەرز و هیممەتبڵند و چاونەترس بێت، لەشکرەکەیشی چاونەترس و هیممەتبڵند و ورەبەرز دەبێ، بەڵام ئەگەر پێچەوانە بوو، ئەوا لەشکرەکە تێکدەشکێت.
- پێویستە مرۆڤ هەمیشەگەشبین بێت و تۆوی گەشبینی لە کێڵگەی ژیاندا بڕوێنێت.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٢٢)

## چی بچێنیت، ئەوە دەدوریتەوە

پاشـایەك، خزمـەتكارێكی هـەبوو، خزمەتكارەكـە هـەموو ڕۆژێ چێشـتی بـۆ لێـدەنا، بـەڵام ئـەو، بـە شـێوەیەكی تونـد و ناشـیرین هەڵسوكەوتی لەگەڵدا دەكرد و لەگەڵی توند و ڕەق بوو..

پاشـا، ماوەیـەكی زۆر لەسـەر هەڵسـوكەوتە توندەكـەی بـەردەوام بـوو، بەڵام دواجار، دڵی بە خزمەتكارەكەی سووتا و بڕیاری دا هەڵسوكەوتی خۆی بگۆڕێت.

بۆ ئەم مەبەستەش بانگی كرد و پێی گوت: بڕیارم داوە لەمەودوا بە جوانی ڕەفتارت لەگەڵدا بكەم.

خزمەتكارەكەی گوتی: باشە ئەگەر نانی نیوەڕۆ كەمێك تاخیر بوو، ناكەی بە هات و هاوار و بەسەرمدا نایقیرێنیت؟

پاشا گوتی: نەخێر.

خزمەتكارەكە گوتی: ئەدی ئەگەر قاوەكەت تۆزێك سارد بێت، نای دەی بە دەم و چاوم دا؟

پاشا گوتی: نەخێر.

خزمەتكارەكە گوتی: ئەگەر كەبابەكەت بەدڵت نەبێت، لە مووچەكەم كەم ناكەیتەوە؟

پاشا گوتی: نەخێر.

خزمەتكارەكە گوتی: كەواتە منیش لەمەودوا تف لە شۆڕبای تۆ ناكەم!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەكانی ئەم چیرۆكە:**

- مرۆڤ چی بچێنێت، ئەوە دەدورێتەوە، هەروەها كاری ناشیاو، كاردانەوەی ناشیاوی لێ دەكەوێتەوە.
- توندوتیژی، جگە لە توندوتیژی، هیچی دیكەی لێ سەوز نابێت.
- پێشینان فەرموویانە: گەورە ئاو دەڕژێنێ، گچكە، پێی لێ دەخشێنێ.
- ........................................................
- ........................................................
- ........................................................

## چیرۆکی

## (٢٣)

# قەیسی فرۆش

کابرایەکی عەرەبانچی، لەسەر جادە قەیسی دەفرۆشت و هاواری دەکرد قەیسی، قەیسی، قەیسی... کیلۆی بە هەزارە و ناوکەکەیشی بە دوو هەزارە؟

کابرایەك بەلایدا تێپەڕی و پێی گوت: ئەوە بۆچی خودی قەیسی بە هەزارە، بەڵام ناوکەکەی بە دوو هەزارە؟

کابرای عەرەبانچیش گوتی: دەزانی بوو، چونکە ناوکەکەی عەقڵ زیاد دەکات!!!

کابراش کیلۆیەکی کڕی و چوو لەو لاوە خەریکی شکاندن و خواردنی ناوکەکەی بوو!!

لەپڕ بەخۆی گوت: باشە بۆچی من قەیسییەکەم نەکڕی، هەم قەیسییەکەم دەخوارد، هەمیش ناوکەکەی؟!!!!!

یەکسەر هاتەوە لای قەیسی فرۆشەکە و پێی گوت: بۆچی منت هەڵخەڵەتاند؟ بەس ناوکە قەیسیت دامێ و بە گرانتریش؟

قەیسی فرۆشەکەش گوتی: ئەی نەمگوت عەقڵ زیاد دەکات!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ مرۆڤ هیچ کارێك ئەنجام بدات، تاکو بە وردی بیری لێنەکاتەوە و لایەنە باش و خراپەکانی هەڵنەسەنگێنێت.
- نابێ مرۆڤ خۆشباوەر بێت و بە هەموو دەهۆڵێك هەڵپەڕێت.
- ئەگەر مرۆڤ فێڵ لە خۆی نەکات، ئەستەمە فێڵی لێ بکرێت.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی
## (٢٤)
## متمانە بەخۆبوون

کچێکی تەمەن (١٥)ساڵ، دەچێتە مارکێتێک و ئیزن لە خاوەنی مارکێتەکە وەردەگرێ و پێی دەڵێ: ئەگەر ئیزنم بدەیت تەلەفۆنێك دەکەم، ئەویش دەڵێ فەرموو.

کچەکەش بەژنی کورت بوو! چووە سەر مێزێك لە ژێرەوەی کابینەی تەلەفۆنەکە و ژمارەی تەلەفۆنەکەی لە گیرفانی دەرهێنا، ئەم دیمەنە سەرنجی خاوەنی مارکێتەکەی ڕاکێشا و بە وردی گوێ لە قسەکانی ڕاگرت.

کچەکەگوتی: ئەڵۆ گەورەم، دەتوانم لە ناو باخچەکەت کار بکەم و گژ و گیای ناو باخچەکەت خاوێن بکەمەوە؟

ژنەکەش وەڵامی دایەوە و گوتی: نەخێر، کارگەرێکم هەیە، ئەو کارەم بۆ دەکات.

کچەکەش پێی دەڵێ: ئامادەم بە نیوەی کرێی ئەو، کارەکەت بۆ بکەم.

خاوەن کارەکەش دەڵێ: مـن لە ئیشی کارگەرەکەم ڕازیم و نامەوێ بیگۆڕم.

کچکە هەر سوور دەبێت لە سەر داوای خۆی و پێی دەڵێ نەك هەر باخچەکەت، بەڵکو پێش دەرگای ماڵەکەشت پاك دەکەمەوە.

دیسان خاوەن کارەکە بە نەخێر وەڵامی دەداتەوە.

کچەکەش زەردەخەنەیەکی دەکات و تەلەفۆنەکە دادەخات!!!

خاوەنی مارکێتەکە، سەری لەم کچە سوڕدەمێنێ و لێی دەچێتە پێشەوە و پێی دەڵێ: زۆر سەرسام بووم بە تۆ! کە هێندە وره‌ت بەرزە و بڕوا و متمانەت بە خۆیە، حەز دەکەم لای من کار بکەیت، کچەکەش وەڵامی دەداتەوە و پێی دەڵێ: سوپاس خاتوون، من کارێکاری ئەو خاوەن کارە بووم، کە ئێستا بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵدا دەکرد، بەڵام ویستم خۆم تاقی بکەمەوە و بزانم خاوەن کارەکەم تا چەند لە ئەدای کاری من ڕازییە و بڕوا و متمانەی بە من هەیە!!!!

## پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:

- ئەگەر مرۆڤ لە کارەکەیدا ڕاست و دروست و دڵسۆز بێت، لای هەموو کەسێك خۆشەویست دەبێت و ڕێزی لێ دەگیرێت، بۆیە کورد وتەنی: (پاڵەی خۆت بە، خۆشەویستی خەڵك بە)!!!!
- ئەوەی حیسابی پاکە، لە موحاسەبەکردن بێباکە.
- پێویستە مرۆڤ جار بەجار خۆی هەڵسەنگێنێت، تاکو عەیاری خۆی بزانێت.
- بڕوا و متمانە بەخۆبوون، مەرجی سەرەکیی سەرکەوتنە.
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی
## (٢٥)
## نیشتمانپەروەری

سوپایەکی داگیرکەر، بە مەبەستی داگیرکردن، هێرشی بردە سەر شارێك. لەشکرەکە بەرەو شارەکە کەوتە رێ و جاسووسەکانی خۆی ناردە دەوروبەری ئەو شارە، بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر شارەکە کۆبکەنەوە!!!!

جاسووسەکان، لە قەراغ شارەکە، پیرەمێردێك و گەنجێکیان بینی، خەریکی دارکردن بوون!

چوونە لای پیرەمێردەکە و داوایان لێکرد کەوا ببێتە چاوساغ و رێنیشاندەریان و زانیاری تەواو لەسەر شارەکەیان و ژمارەی سەربازەکانی وڵاتەکەیان بداتێ، بۆ ئەوەی شارەکەیان داگیر بکەن، لە بەرامبەر ئەم کارەشدا، پاداشت دەکرێت!!!!!

پیرەمێردەکە گوتی: بەسەرچاو، ئەو کارەتان بۆ دەکەم، بەڵام مەرجێکم هەیە!!

گوتیان مەرجەکەت چییە؟

پیرەمێردەکە گوتی: مەرجەکەم ئەوەیە، ئەم گەنجە بکوژن، بۆ ئەوەی نەبێتە شاهێد لەسەر قسەکانم.

ئەوانیش گوتیان زۆر باشە.

یەکێك لە جاسووسەکان، دەستی دایە شمشێرەکەی و سەری ئەو گەنجەی پەڕاند و خوێنی ئاڵی ڕژایە سەر زەوی!!

پیرەمێردەکە، بە جاسووسەکانی گوت: ئایا دەزانن ئەوەی کە کوشتتان کێ بوو؟

گوتیان ئێمە نازانین، تۆ باشتر دەزانی!!!

پیرەمێردەکە گوتی: ئەو گەنجە، کوڕە خۆشەویستەکەم بوو! دەمویست بەر لە من بکوژرێت، چونکە لەوە دەترسام، بمکوژن، ئینجا دوای کوشتنم، کوڕەکەم ناچار بکەن کەوا زانیاریتان بداتێ و ببێتە جاسووس و ڕێنیشاندەرتان!!

بۆیە کوشتنی کوڕەکەم پێ خۆشتر و باشتر بوو، نەوەك ببێتە جاسووس و نیشتمانەکەی بە ئێوە بفرۆشێت!!!

جاسووسەکان گەڕانەوە لای سەرکردەکەیان و پیرەمێردەکەیان جێهێشت، کە لەسەر لاشەی کوڕەکەی وەستابوو!!

کاتێ گەیشتنە لای سەرۆکەکەیان، بەسەرهاتی خۆیان و ئەو پیرەمێردەیان بۆ گێڕایەوە!!

سەرۆکی سوپایەکەش گوتی: پێویستە دەستبەجێ پاشەکشێ بکەین و بگەڕێینەوە وڵاتی خۆمان، چونکە گرتنی ئەم شارە ئەستەمە، مادام باوکەکان لەپێناو ئەم شارەدا، ئامادەن کوڕەکانیان بیکەنە قوربانی، ئێمە ناتوانین داگیری بکەین.

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- دەبێ بەرژەوەندی نەتەوایەتی و نیشتمانی، بخرێتە بەرایی بەرژەوەندی کەسییەوە.
- بەهای ئازادی گرانە، ئەو میللەتەی ئازادی و سەرفرازیی دەوێ، دەبێ ئامادە بێت لە پێناو ئازادی و سەربەخۆییدا قوربانی بدات، بۆیە لەمبارەیەوە شاعیر دەڵێ: (داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێت، قەت بەرناگرێت، هەروەها دەڵێ: (مردن لە ڕێی نیشتمان بێت، سەد ژیانی بە قوربان بێت)، هەمدیس دەڵێ: (پێی ناوێ بۆ شەهیدانی وەتەن شیوەن و گرین، نامرن ئەوانە، وا لە دڵی میللەتان دەژین).
- هەمیشە داگیرکەران لە ڕێی تابۆری پێنجەم و جاسووسەکانییەوە توانیویانە گورزی خۆیان بوەشێنن!!
- داگیرکەران هەمیشە لە ڕێی پارەوە هەوڵیان داوە کەسانی خۆفرۆش بکڕن.
- سەرکردەی وشیار، دەبێ تفەنگ بە تاریکییەوە نەنێت و تا شوێن پێی خۆی نەبینێت، لە خۆڕا هەنگاو نەنێت.
- ..........................................................
- ..........................................................
- ..........................................................

## چیرۆکی

## (٢٦)

## کێ گەمژەیە؟

منداڵێکی بچووك چووە ناو سەرتاشخانەیەك.

خاوەنی سەرتاشخانەکە، بە هاوڕێیەکەی گوت، کە ئەو ڕۆژە لەوێ دانیشتبوو: ئەم منداڵە گەمژەترین منداڵی سەر زەوییە!!!

چاوەڕێ بە، ئێستا بۆت دەسەلمێنم.

خاوەنی سەرتاشخانەکە، (١)دۆلاری کردە ناو دەستێکی و(٢٥)سەنتیشی کردە دەستەکەی دیکە.

بە منداڵەکەی گوت: کامیانت دەوێ بۆ خۆتی ببە!!

منداڵەکە، (٢٥) سەنتەکەی هەڵبژارد و لێی دا و ڕۆیشت!!

خاوەنی سەرتاشخانەکە گوتی: ئەم منداڵە هێندە گەمژەیە هەموو جارێ هەر (٢٥) سەنتەکە دەبات!!!

هاوڕێیەکەی چووە دەرەوە، سەیر دەکات منداڵەکە، بەو(٢٥) سەنتە، ئایس کرێمی کڕیوە و خەریکی خواردنیەتی!!!

خۆی لە منداڵەکە نزیك کردەوە و پێی گوت: دەمەوێ بزانم بۆچی هەمیشە (٢٥) سەنتەکە هەڵدەبژێری و دۆلارەکە هەڵنابژێری؟!!!!

منداڵەکە گوتی: ئاخر ئەگەر دۆلارەکە ببەم، یارییەکە کۆتایی دێت و گەڕێکی دیکە پارەم ناداتێ!!!!!

بۆیە دەڵێن:(گەمژەی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە، کە کەسانی دیکە بە گەمژە بزانێت).

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ مرۆڤ هیچ کەسێك بە گەمژە بزانێت، چونکە بە گەمژەزانینی خەڵك، نیشانەی ئەوەیە، کە خۆی گەمژەیە.
- مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە فێلی لێ نەکرێت.
- نابێ مرۆڤ، بە چاوێکی کەم سەیری کەسانی کەم تەمەن بکات، چونکە زۆر جاری وا هەبووە کەسێکی بچووك لە کەسێکی گەورە، ژیرتر و عاقڵتر بووە، هەر بۆیە دەڵێن:( ژیریی بە گەورەیی و بچووکی نییە).
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

# چیرۆکی

## (٢٧)

## کێشەی دوو برا

کێشەی دوو برا لە وڵاتی عەرەبستانی سعودی، هەمووانی تووشی شۆك کرد!!

کێشەی ئەو دوو برایە بەم شێوەیە بوو: لە وڵاتی سعودییە، کێشەیەك لە نێوان دووبرا ڕووی دا!

یەکێك لەو دوو برایە ناوی (حیزان) بوو، تەمەنی لە سەرووی حەفتا ساڵییەوە بوو، کاتێ لە دادگا، لە بەردەم دادوەر فرمێسك لە چاوەکانی دەهاتنە خوارەوە و بە گریانەوە کێشەی خۆی بۆ دادوەر باس دەکرد.

جا دەبێ گریان و فرمێسکەکانی ئەو پیاوە بەساڵاچووە لەسەر چی بێت؟!!!

ئایا منداڵەکانی لەگەڵ خراپ بوون؟

یاخود براکەی پارچە زەوییەکی لێ داگیر کردبوو؟

یان لەسەر میرات و...تاد.

نەخێر کێشەی ئەو دوو برایە لەسەر هیچ یەکێك لەوانەی سەرەوە نەبوو!! بەڵکو کێشەی ئەو دوو برایە لەسەر ئەوە بوو، هەر یەکێك لەو دووبرایە دەیویست دایکە پیرەکەی لای ئەو بێت و لە ژێر چاودێری ئەو دابێت!!

شایانی ئاماژەپێدانە، ئەو پیرە دایکە، هیچ ماڵ و موڵکێکی نەبوو، کە بۆ خاتری ماڵ و موڵکی ئەو، ئەم دوو برایە ببێت بە شەڕیان!!!

دایکی ئەم دوو برایە، لای(حێزان)ی کوڕە گەورەکەی بوو، کوڕە بچووکەکەی، هەستا چوو لای(حێزان)ی برا گەورەکەی و پێی گوت: برا خۆشەویستەکەم، تا ئێستا دایکمان لای تۆ بووە و بە چاکی خزمەتت کردووە، ئێستاش تۆ چوویتە تەمەنەوە و کاتی ئەوە هاتووە ئیزنم بدەی بیبەمە لای خۆم و بەخێوی بکەم!!

بەڵام حێزانی برای، ئەم داواکارییەی ڕەت کردەوە و ڕازی نەبوو دەستبەرداری بەخێوکردنی دایکی بێت!!!!

بۆیە بۆ بە کێشەیان و ناچار بوون کێشەکەیان بردە دادگا و چوونە بەردەم دادوەر، دوای چەند دانیشتنێك، هەردوو برا سووربوون لەسەر ئەوەی کە دەبێت دایکی لە ژێر چاودێری ئەو دابێت!!

دواجار دادوەر بڕیاری دا کە دایکیشیان لە دادگا ئامادە بێت، بۆ ئەوەی بزانێت ڕای ئەو چییە و ئەو چ بڕیارێك دەدات!!!!

لە ڕۆژی دیاریکراودا، دایکی ئەو دوو کوڕەیان هێنا و لە بەردەم دادوەر ئامادە بوو، کە کێشی لە ٢٠ کیلۆ تێپەڕی نەدەکرد!!!

دادوەر لە دایکی ئەو دوو کوڕەی پرسی: دایە گیان حەزت لێیە لای کامەیان بیت، کوڕە گەورەکەت، یان بچووکەکەت؟

دایکەکە لە وەڵامدا گوتی: کوڕە گەورەکەم چاوی ڕاستمە، کوڕە بچووکەکەشم چاوی چەپمە!!!

لەو کاتەدا فرمێسك بە چاوەکانی دادوەرەکەدا هاتە خوارەوە و ناچار بوو، خۆی بڕیاری یەکلاکەرەوە بدات و بڕیاری دا، کە ئەو دایکە بەساڵاچووە لە ژێر چاودێری کوڕە بچووکەکەی دابێت، چونکە کوڕە گەورەکەی چووەتە تەمەنەوە و ناتوانێ وەك پێویست خزمەتی دایکی بکات.

جا لەو کاتەدا، کوڕە گەورەکەی وەك منداڵ لەبەردەم دادوەر دەگریا، لە ئاهی ئەوەی چیتر ناتوانێ خزمەتی دایکی بکات!!!

ئاخۆ دەبێ ئەم دایکە، ئەم کوڕانەی چۆن پەروەردە کردبێت، کە بەم شێوەیە کێبڕکێ بکەن بۆ ئەوەی خزمەتی بکەن و بەخێوی بکەن!!!!!!!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ لە ژیاندا چی بچێنێت، ئەوە دەدورێتەوە.
- بەهەشت لە ژێر پێی دایك دایە، بۆیە هیچ کام لەم دوو کوڕە نەیویستووە بەهەشت لە دەست خۆیان بدەن.
- پێویستە مرۆڤ وەك دادوەرەکە لە بڕیارداندا دادپەروەر بێت.
- دایك پێویستە وەك ئەم دایکە بێت و جیاوازی لە نێوان منداڵەکانیدا نەکات.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

# چیرۆکی

## (٢٨)

## مامۆستای ژیر

لەناو پۆلەکەدا بۆقێك قیرە قیری دەکرد!!!

مامۆستاکە گوتی: دیار، ئەم بۆقە لە پۆلەکە ببە دەرەوە!!

دیار گوتی: مامۆستا، بەیارمەتیت، من لە بۆق دەترسێم!!!

مامۆستا گوتی: ئاری، تۆ هەستە ئەو بۆقە ببە دەرەوە!!

ئەویش گوتی: مامۆستا، ببۆرە. منیش لێی دەترسێم.

مامۆستا هاتە پێشەوە و ڕووی لە قوتابیان کرد و گوتی: منداڵەکان... کێ لە بۆق ناترسێت؟

لە ناو هەموو قوتابییەکان، تەنیا ئازاد گوتی: مامۆستا، بەیارمەتیت، من لێی ناترسێم.

مامۆستاش گوتی: هەستە کتێبەکانت هەڵگرە و لەم پۆلە برۆ دەرەوە!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤی ژیر، دەبێ هۆکاری سەرهەڵدانی هەر کێشەیەك بدۆزێتەوە، ئینجا چارەسەری بکات.
- مرۆڤی هۆشمەند دەبێت بتوانێ بەرامبەر خۆی بخوێنێتەوە.
- نابێ مرۆڤ هێندە سادە و ساویلکە بێت، نهێنی خۆی ڕادەستی کەسانی دیکە بکات.
- مرۆڤی یاسا شکێن و سەرپێچیکار، دەبێ سزای خۆی وەربگرێت.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی

## (٢٩)

## لە کاتی تووڕەیی بڕیار مەدە

دایکێك دەڵێ: ڕۆژێك کچەکەم زوو لە قوتابخانە گەڕایەوە، گوتم خێرە کچم، بۆچی زوو هاتییەوە؟

کچکەکەم خەریك بوو دەگریا، لە تاو ئازاری سکی!!!

چەندی بووم شێلا، سوودی نەبوو، هەستم کرد سکی کەمێك ئاوساوە!!

کچەکەم چەندین جار هاواری دەکرد و دەیگوت: دایەگیان بەرگەی ئەم ژانە ناگرم، خەریکە شێت دەبم!!!

منیش تەلەفۆنم بۆ باوکی کرد و بردمانە نەخۆشخانە!

دوای ئەنجامدانی هەندێ پشکنین، دکتۆرەکە هەواڵی پێداین کە ئەم کچە دووگیانە؟

من و باوکی، بەم هەواڵە حەپەساین!!

گوتمان دکتۆرگیان، ئەم کچە هێشتا شووی نەکردووە، چۆن دووگیانە؟

دکتۆرەکە گوتی لە ئەنجامی پشکنینەکاندا ئاوا دەرکەوتووە کە دووگیانە!!!

بردمانەوە ماڵەوە، هەرهەموومان زۆر لێی تووڕە بووین، باوکی و براکەی، تێر و پڕ لێیان دا، منیش زۆر سەرزەنشتم کرد و پێم گوت بەس بڵێ چیت کردووە؟

ئەو کچە لە تاو ئازاری سکی و ئەو هەموو لێدانە، هەر دەگریا و دەیگوت: سوێند بەخوا هیچم نەکردووە، دایە... بابە، تکایە بڕوام پێ بکەن!!! بەزەییتان بەمندا بێتەوە.. خەریکە دەمرم!!

سوێندتان بۆ دەخۆم کە هیچ کەسێك دەستی لێنەداوم، تۆ خوا دایەگیان بڕوام پێ بکەن!!!

منیش دەمگوت: ئاخ خۆزگە پێش ئەم ڕووداوە مردبام، تاکو کچەکەم بەم حاڵە نەدیتبایە!!!

کچەکە هەر دەگریا، باوکی و برای، دڕندە ئاسا کەوتبوونە گیانی و هەر لێیان دەدا وگوتیان: خۆ تۆ حەزرەتی مەریم نیت بەبێ پیاو منداڵت هەبێت؟ پێمان بڵێ، کێ ئەم کارەی لەگەڵدا کردی، دەنا دەتکوژین؟

کچەکەش هاواری دەکرد و دەیگوت دایە گیان خۆت دەزانی من چ کچێکی داوێنپاکم، من لەسەر دەستی تۆ پەروەردە کراوم!!!

باوکی گوتی: تۆ سەگی سەگ، تۆ لە ئێمە نیت!!

هەی بێ ئابڕوو، شەرفت بردین، شەرت بێ هەر بتکوژم!!!

دووبارە لێی دایەوە و برایەکەیشی گوتی: ئێستا بە چ ڕوویەك بچمە لای برادەرەکانم، لە کاتێکدا خوشکەکەم کاری بێ ڕەوشتی ئەنجام دابێت!!!

دیسان کچەکە هاواری کرد و گوتی من دووگیان نیم، بەڵام ئەم جارەیان برایەکەی زلەیەکی توندی لێدا و بە قژی ڕاکێشا تاکو بوورایەوە!!!!

ئێمەش دەرگامان لەسەری داخست، کاتێ کچەکە بەهۆش خۆی هاتەوە، زانی کە بڕوای پێناکەین، ئیدی خۆی بێدەنگ کرد!!!

چەندین جار ویستم بە دزی پیاوەکەمەوە خواردنی بۆ ببەم، بەلام نەدەوێرام، چونکە پیاوەکەم خەریك بوو ماڵمان بەسەردا بڕوخێنێت!!!

لەگەڵ باوکی کەوتمە قسەکردن، گوتم باشتر وایە ئەو کەسە بدۆزینەوە و هەوڵدەین کچەکەمان لە خۆی مارە بکات، بۆ ئەوەی لەم کێشەیە ڕزگارمان بێت.

بەڵام باوکی کچەکە ڕازی نەبوو، بۆیە خۆی و برای، بڕیاراندا کچەکەم بیکوژن!!!

منیش کە ئەمەم زانی، چووم دەرگام کردەوە، بینم هەر خەریکی گریانە! دواتر باوکی و برای بە چەکەوە خۆیان کرد بە ژوورەوە و خەریك بوو بیکوژن، کچەکەم دووبارە دەستی بە هاوار کردەوە و گوتی: دایە.. بابە... کاکە، بەخوا من پاکم، من دووگیان نیم، تکایە بڕوام پێ بکەن!

من سکاڵای خۆم دەبەمە لای خوا..!!!

منیش زۆر دڵم پێی سووتا و گوت: بەخوا شتێك لەم کچە بکەن، ئەم ماڵە بەجێدێڵم و ناگەڕێمەوە، هەر ئێستاش دەبێ بیبەینە نەخۆشخانە...

کچەکە دووبارە بوورایەوە، بە پەلە گەیاندمانە نەخۆشخانە، بەڵام چی ڕوویدا..!!!

دوای ئەوەی دووبارە پشکنینیان بۆ کردەوە، دەرکەوت کچەکەم دووگیان نییە، بەڵکو کیسەی هەبوو، ئەو کیسەیە، سکی ئاوساندبوو!!!!

بەو هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بووم.

بەڵام دکتۆرەکەی بە شڵەژاوی هاتە دەرەوە، گوتم دکتۆر، تۆ خوا حاڵی کچەکەم چۆنە؟ دکتۆرەکە گوتی: بەداخەوە، بەهۆی ئازارەکانییەوە گیانی

سپاردووه و مردووه!! بەم قسەیە ئەژنۆم شکا!! باوکی و براکەی دای لە پرمەی گریان، بەڵام ئیدی کار لە کار ترازابوو، چونکە ئەوەی کە نەدەبوو بیکەین، بەرامبەر بەو کچە کردمان!!!!

کچەکەمان ئێستا مردووە، بەڵام قسەکانی هەر لە ناو گوێماندا دەزرینگێتەوە، کە دەیگوت: دایە...بابە...کاکە... تۆ خوا بڕوام پێ بکەن، من دووگیان نیم!!!!

ئێستاش پێش خەوتن، بیر لە کۆتا ڕستەی دەکەمەوە کە دەیگوت: من بێ تاوانم، ئێوە ناهەقیتان کرد بەرامبەرم، ئەی خوایە لێم خۆش بە......

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ مرۆڤ تفەنگ بە تاریکییەوە بنێت.
- بەهۆی بڕیاری بە پەلە، مرۆڤ دەکەوێتە هەڵە و تەڵەوە.
- پێویستە هەموومان بەو دەقە یاسایە کار بکەین کە دەڵێت: تۆمەتبار، بێ تاوانە، تا تاوانەکەی بەسەریدا ساغ نەبێتەوە.
- هەرگیز هەڵە بە هەڵە ڕاست ناکرێتەوە.
- هەندێ هەڵە هەن، قەرەبوو ناکرێنەوە، بۆیە دەبێ بە وریاییەوە سەرەدەری لەگەڵ پێشهات و ڕووداوەکانی ژیان بکەین.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

(٣٠)

## وانەی باوکێک بۆ کوڕەکەی

کوڕێك ژنی هێنا وماڵی خۆی جیاکردەوە.

باوکی، چوو پیرۆزبایی لێ بکات.

گوتی: کوڕم کاغەزێك و قەلەمێك و مەساحە(پاککەرەوە)یەکم بۆ بهێنە!

کوڕەکەی گوتی: باوکە بۆ چیتە؟!

باوکی گوتی: تۆ بیهێنە، کارم پێیانە!

کوڕەکەی بۆی هێنا.

باوکی گوتی: کوڕم شتێك بنووسە!!

کوڕەکەی شتێکی نووسی.

باوکی گوتی: دەی بە مەساحەکە بسڕەوە.

کوڕەکە سڕییەوە.

باوکەکەی گوتی: دەی دیسان بینووسەوە و بیسڕەوە!!

چەند جارێك ئەمەی پێ دووبارە کردەوە!!

کوڕەکە گوتی: تۆ خوا بابەگیان نهێنی ئەم کارەم پێ بڵێ!!

باوکی گوتی: کوڕی شیرینم، ژیانی هاوسەرگیریی پێویستی بەم مەساحەیە هەیە، دەبێ خۆت و خێزانت ئەم مەساحەیەتان بەدەستەوە بێت، هەر کاتێ کارێکی ناشیرین، یان هەڵوێستێکی ناشیاوت لە خێزانەکەت بینی،

بیسرِەوە، ئەویش هەر کاتێ کارێکی ناشیرین، یان هەڵوێستێکی ناشیاوی لە تۆ بینی، بیسرِێتەوە.

ئەگەر وا نەکەن، لاپەڕەکانی ژیانتان بە چەند ڕۆژێك پڕ دەبێت، ئەو کاتە سرِینەوەیان زۆر زەحمەت دەبێت!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- پیاوی گەورە و بە ئەزموون و دونیا دیدە و گەڕیدە، وەك سێبەر وایە، مرۆڤ لە سایەیدا دەحەسێتەوە و ئۆقرە دەگرێت.
- ژیان بەبێ لێبوردەیی، دەبێتە ژان.
- ژیانی هاوسەرگیری، دوولایەنەیە، بۆ ئەوەی ئەم پرۆسەیە سەرکەوتوو بێت، دەبێ هەردوولا ئامادەباشی ئەوەیان تێدا هەبێت لە پێناو یەکتری قوربانی بدەن.
- پێویستە گەورەکان، بەتایبەتی دایکان و باوکان بۆ منداڵ و نەوەکانیان دڵسۆز و خەمخۆر بن.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٣١)

## هیممەتبەرزی

چەند کەسێك لە پردێك دەپەڕینەوە، لە ناکاو، دوو کەس لە پردەکە کەوتنە ناو ڕووبارێکی پڕ لە شەپۆلەوە.

هەمووان لە کەنار پردەکە کۆبوونەوە، بەشکم بتوانن ڕزگاریان بکەن، بەڵام شەپۆلەکانی ئاو هێندە بەهێز بوون، نەیانتوانی هیچ بە هیچ بکەن و لە ئاست ئەم دیمەنە تراژیدیایە دەستەوەستان بوون!

بۆیە هەمووان پێکەوە هاواریان کرد: ئێمە هیچمان بۆ ئێوە لە دەست نایەت، تکایە چاوەڕوانی ئێمە نەکەن، خۆتان ڕزگار کەن!!!!

یەکێك لەو دوو کەسانە، هیچ ئومێدێکی بە ڕزگار بوون نەمابوو، بۆیە دوای ماوەیەکی کەم، لە جووڵە وەستا و شەپۆلەکانی ئاو بردی و گیانی لە دەست دا..!!!

هەرچەند ئەوانەی لە دەرەوە وەستابوون، بەردەوام هاواریان دەکرد: کە کەس ناتوانێ لەم ڕووبارە شەپۆلدارە ڕزگاری بێت، بەڵام کابرای دیکە، هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی خۆی بگەیەنێتە کەناری ڕووبارەکە و ڕزگاری بێت.

دوای بزاف و کۆششێکی بەردەوام، توانی لە ئاوەکە بێتە دەرەوە، بەڵام تا لە ئاوەکە نەهاتە دەرەوە، هاوڕێکانی، نەیانزانی کەسێکی کەڕە و ئاگای لە هیچ قسەیەك نەبووە!!!!!

لە ڕاستیدا ئەو بۆیە هێندە بە جۆش و خرۆشەوە هەوڵی دەدا خۆی ڕزگار بکات، چونکە پێی وابوو ئەوانی دیکە لە دەرەوە هانی دەدەن و تەشجیعی دەکەن بۆ ئەوەی بە سەلامەتی لە ناو ئاوەکە بێتە دەرەوە و نەخنکێ، کەواتە کەڕبوونەکەی، هۆکاری ڕزگاربوونەکەی بوو!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- پێویستە مرۆڤ لە ئاست ڕەخنە نەرێنییەکانی خەڵك کەڕ بێت.
- نابێ ئێمە لە ژیاندا بێ ئومێد بین، ئەگەر چی کۆسپ و لەمپەرەکانیش زۆر بن و بەرۆکی ئێمە بگرن.
- ئەگەر مرۆڤ نەتوانێ ببێتە گوڵ، هەر هیچ نەبێت با دڕکیش نەبێت.
- هەموو کەسێك خاوەنی هێزێکی زۆری پەنهان و شاراوەیە، بەڵام پێویستە ئەو هێزە بدۆزێتەوە و لە کاتی پێویست سوودی لێوەربگرێت.
- هاندان هۆکارێکی زۆر گرنگ و کاریگەرە، بۆ پێشڤەچوونی مرۆڤ لە گشت کایەکانی ژیاندا.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی

## (٣٢)

## ڕەوشت لە ناخی خەڵکیدا بچێنن

منداڵێکی تەمەن نۆ ساڵان، شووشەیەکی بچووکی بینی بەدەست باوکییەوە، کە پرتەقاڵێکی گەورەی تێدا بوو!!!

منداڵەکە سەری سوڕما، بۆیە لە باوکی پرسی: چۆن ئەو پرتەقاڵەت خستۆتە ناو ئەو شووشەیەوە، چونکە سەری شووشەکە زۆر تەسکە؟!!!

منداڵەکە هەوڵیدا پرتەقاڵەکە دەربهێنێت، بەڵام هەوڵەکەی بێسوود بوو.

باوکەکە، منداڵەکەی بردە ناو باخچەیماڵەکەیان، ئینجا شووشەیەکی بەتاڵی هێنا و بەستییەوە بە درەختێکی پرتەقاڵەوە و پرتەقاڵێکی بچووکی خستە ناو شووشەکەوە و وازی لێهێنا.

بەتێپەڕبوونی کات، هێدی هێدی پرتەقاڵەکە لەناو شووشەکەدا گەورە بوو، هەتا وای لێهات نەتوانرێت لە شووشەکەدا دەربهێندرێت.

ئەو کاتە منداڵەکە، پەی بە نهێنی گەورەبوونی پرتەقاڵەکەی برد و پەندێکی باشی لێ وەرگرت!! بەڵام باوکەکەی، ئەمەی بەهەل زانی، تا منداڵەکەی فێر بکات و پێی بڵێت: کوڕی خۆم، ئەوە ڕەوشتە! ئەگەر توانیمان بە منداڵی (ڕەوشت)، لە ناخی کەسێکدا بچێنین، زۆر ئاستەمە بەگەورەیی بتوانین ئەو ڕەوشتە لە ناخیدا دەربهێنین، هەر وەکو

پرتەقاڵەکــەی!! چونکــە دەرهێنــانی ئەســتەمە، مەگــەر شووشــەکە بشکێندرێت!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- فێربوون لە تەمەنی منداڵی، وەك نەخشەی سەر بەرد وایە، بە ئاسانی ناسڕێتەوە، بۆیـە گـوتراوە: ئـەوەی بـە شـیری وەریگرتـووە، بـە پیـری بەرینادات!!!
- ئەگەر مرۆڤ سەری لە شتێك دەرنەکرد، پێویستە لە کەسانی لە خۆ زاناتر بپرسێت.
- بۆ سەلماندی ڕاستییەکان، پێویستە بەڵگەی ڕاستەقینەمان لەبەر دەست بێت، بۆ ئەوەی زیاتر قەناعەت بە کەسانی دیکە بکەین.
- بـۆ تێگەیشـتن لـە شـتە سەرسـوڕهێنەرەکان، دەبـێ گـۆمی مەنـدی هزرەکانمان بشڵقێنین!!!!
- ............................................
- ............................................
- ............................................

# چیرۆکی

## (٣٣)

## ڕێوی و وشتر

ڕێوییەك، دیتی وشترێك لە ناو پەڕییەوە، ڕێوییەکە پرسیاری لە وشترەکە کرد: ئاوەکە چەند قووڵ بوو؟

وشترەکە گوتی: تا نزیك ئەژنۆ قووڵە!!!

ڕێوییەکە دەستی کرد بە پەڕینەوە لە ئاوەکە، بەڵام هێندەی نەمابوو نغرۆ ببێت و لە ناو ئاوەکەدا بخنکێت!!!

دوای ئەوەی لە ئاوەکە ڕزگاری بوو، بە وشترەکەی گوت: بۆچی درۆت لەگەڵدا کردم و هەڵت خەڵەتاندم؟

ئەی نەتگوت تا ئەژنۆیە؟!!!

وشترەکەش گوتی: با، بەڵام تا ئەژنۆی من بوو، نەك ئەژنۆی تۆ!!!!

ئینجا ڕێوییەکە پەی بەو ڕاستییەی برد، کە مەرج نییە ئەزموونی یەکێك بۆ یەکێکی دیکە گونجاو بێت!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- دەبێ مرۆڤ وەك خۆی بیر بکاتەوە، نەك وەك کەسێکی دیکە.
- نابێ خۆمان لەگەڵ کەسێکی دیکە بەراورد بکەین، چونکە مەرج نییە ئەوەی بۆ ئەو گونجاو بێت بۆ ئێمەش گونجاو بێت.
- ئەگەر مرۆڤ دووچاری هەڵەیەك بوو، پێویستە لۆمە و سەرزەنشتی خۆی بکات، نەك کەسانی دیکە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٣٤)

## وەسیەتی پاشایەک بۆ وەزیرەکانی

دەڵێن: پاشایەك تووشی نەخۆشییەکی کوشندە دەبێت، بۆیە پێش ئەوەی بمرێت، وەسیەتی خۆی دەنووسێت و داواش لە وەزیرەکانی خۆی دەکات، کە وەسیەتەکەی وەك خۆی جێبەجێ بکەن.

وەسیەتی پاشا لەم سێ خاڵە پێکهاتبوو:

١. هەرکاتێ مردم، تەنیا دکتۆرەکانم داربەستەکەم هەڵبگرن بۆ گۆڕستان.

٢. هەرکاتێ مردم، پێش ئەوەی داربەستەکەم بگوازنەوە بۆ گۆڕستان، ڕێگای ماڵەکەم تا گۆڕستان بە گەوهەری گرانبەها بڕازێننەوە.

٣. کاتێ داربەستەکەم لەسەر شان هەڵدەگرن، هەردوو دەستەکانم بکەنەوە و لە داربەستەکە دەری بهێنن.

وەزیرەکان گوتیان بەلێ قوربان، وەسیەتەکەت وەك خۆی جێبەجێ دەکەین، بەڵام حەز دەکەین پێش ئەوەی بمریت، حیکمەتی ئەو کارەمان پێی بڵێیت!! پاشایەکە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: لەبارەی خاڵی یەکەمەوە دەمەوێ بە خەڵك بڵێم: ئەگەر مردن هات، بە هیچ کەسێك ناگەڕێتەوە، تەنانەت بە دکتۆرەکانی (پاشا)ش!!!!!

لەبارەی خاڵی دووەمەوە: دەمەوێ بە خەڵك بڵێم: من هەموو تەمەنی خۆم بۆ کۆکردنەوەی پارە و پووڵ و سەروەت و سامانی دونیا تەرخان کردبوو، بەڵام هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندم!!!!

لەبارەی خاڵی سێیەمەوە: دەمەوێ بە خەڵك بڵێم: کە بە دەستی بەتاڵەوە هاتوومەتە دونیا، بە دەستی بەتاڵیشەوە دونیام بەجێهێشت!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- دونیا تاسەر بۆ کەس نابێت، جا دەوڵەمەند بێت یان هەژار، وەزیر بێت یان گزیر، زانا بێت یان نەزان، پاشا بێت یان کرمانج!!!!
- پێویستە مرۆڤ سوود لە بەسەرهاتی ئەو کەسانە وەربگرێت، کە دونیا بەجێدێڵن.
- پەند وەرگرتن لە ئەزموونی کەسانی دیکە، کارێکی زێدە پێویست و گرنگە.
- نابێ مرۆڤ بە پارە و پووڵ، یان دەسەڵات لەخۆبایی بێت، چونکە هیچ شتێك تاسەر نامێنێ.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (٣٥)

## پەیامی خۆشەویستی

پیاوێك دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لەسەر داوای ڕێکخراوێکی ژنان، کە هاوسەرەکەم ئەندام بوو تێیدا، هاوسەرەکەم داوای لێکردم، کە چەند سیفەتێکی خراپی ئەو، لەسەر پارچە کاغەزێك بنووسم و لە ناو پاکەتێکی داخراودا دایبنێم، بۆ ئەوەی ڕێکخراوەکە گفتوگۆ لەسەر ئەو بابەتانە بکات.

منیش ئاوا بۆ ڕیکخراوەکە نووسیم:

(هاوسەری خۆمم زۆر خۆش دەوێ و تا ئێستا هەستم پێنەکردووە هیچ سیفەتێکی خراپی تێدا بێت)!!!

ئینجا کاغەزەکەم خستە ناو پاکەتێکەوە و دامخست و دامە دەست هاوسەرەکەم!!!!

ڕۆژی دواتر، کاتێ لەسەر ئیش دەگەڕامەوە، هاوسەرەکەم، بە چەپکێ گوڵەوە لە چاوەڕوانی من دابوو!!!

بەو چەپکە گوڵە پێشوازییەکی گەرمی لێکردم و لە خۆشییا چاوەکانی پڕ بوو بوون لە فرمێسکی شادی!!!!

دەزانن بوو؟!!!

چونکە ئەو پێی وابوو من یەکە بە یەکەی خراپەکانی ئەو، بۆ ڕێکخراوەکە دەخەمە ڕوو، هاوسەری ئەو پیاوە خۆی دەڵێ: من وام دانا بوو

کە لانی کەم باسی شەش سیفەتی خراپم هەر دەکات، چونکە ئەو شەش سیفەتەم لە خۆدا بەدی دەکرد، بەڵام کە نامەی هاوسەرەکەمیان خوێندەوە، تووشی شۆک بووم، بەتایبەتی یەکەم جار بوو، پیاوەکەم لای خەڵك مەدحم بکات!!!!

ئەم هەڵوێستەش وای کرد، کە هاوسەری ئەو پیاوە ٧٠% ڕەفتارەکانی خۆی بگۆڕێت و مامەڵەیەکی جوانتر لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بکات!!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- پێشینان فەرموویانە، مار بە قسەی خۆش لە کونێ دێتە دەرێ.
- هاندان، کاریگەرییەکی زۆر ئەرێنی و باش لەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤ جێدێڵێت.
- دەبێ مرۆڤ کەم و کوڕی و کێماسییەکانی کەسانی دیکە لای خەڵك باس نەکات، چونکە ئەسڵ وایە عەیبەکانی یەکتری داپۆشین، نەك ئاشکرای بکەین.
- ڕەنگە هەڵویستێکی جوان، ببێتە خاڵی وەرچەرخان و ژیانی مرۆڤ بگۆڕێت.
- مرۆڤی دڵ گەورە، کەسانی دیکە ناشکێنێتەوە، ئەگەر چی ڕەفتارەکانیشیان بەدڵی ئەو نەبن.
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆكی
## (٣٦)
## كوڕێكی بێ وەفا

خێڵێكی كۆچەری خەڵكی بیابان، خەریكی بەخێوكردنی مەڕ و ماڵات و كاری ئاژەڵداری بوو!!

كۆچەرەكان وەكو نەریتێك، لە پێناو دابینكردنی خۆراك و ئاو بۆ ئاژەڵەكانیان، هەرجارێ لە جێیەك نیشتەجێ دەبوون و گەرمیان و كوێستانیان دەكرد.

لەناو ئەو خێڵەدا، پیاوێك هەبوو، دایكێكی زۆر پیری هەبوو، ئەم دایكە بەهۆی زۆریی تەمەنییەوە، تووشی بیرچوونەوە بوو بوو!! ئیتر كوڕەكەی تەواو لە دەستی بێ تاقەت و بێزار بوو بوو...

ڕۆژێكیان، خێڵەكەیان بڕیاریدا كۆچ بكەن بۆ ناوچەیەكی تر، پیاوەكە بەخێزانەكەی گوت: ئەگەر ئەم جارە كەوتینە ڕێ، دایكم لێرە بەجێبێڵە و بڕێك خۆراك و ئاوی بۆ دابنێ، هەتا دڕندەیەك دەخوات، یان بەخۆی دەمرێت!!!

ژنەكەش گوتی: باشە، فەرمانەكەت جێبەجێ دەكەم.

ژنەكە، دایكی مێردەكەی (خەسوو)ی بەجێهێشت، بەڵام شتێكی سەرسوڕهێنەری كرد، كوڕە تەمەن یەك ساڵانەكەی خۆی لەگەڵ

خەسوویدا بەجێهێشت، هەرچەندە زۆریشی خۆشدەویست و دڵەکەی پەیوەست بوو پێیەوە..!!

کاتی نیوەڕۆ، خێڵەکە دانیشتن بۆ پشوودان، بۆ ئەوەی نان بخۆن، پیاوەکەش لەگەڵ خێزانەکەی دانیشت، داوای لە ژنەکەی کرد کەوا منداڵە یەك ساڵانەکەی بۆ بهێنێت، تاکو یاریی لەگەڵ بکات!!

ژنەکەش لەو کاتەدا پێی گوت: لەگەڵ دایکت بەجێم هێشتووە، نامانەویّ!!!!

پیاوەکە بە سەرسوڕمانییەوە گوتی: چی؟!! چۆن شتی وادەبێت؟!! زۆر خۆی لیّ تووڕە کرد و بەسەریدا قیڕاندی!!

ژنەکەش پێی گوت: پیاوەکە، دەزانی بۆچی نەمهێناوە؟!! چونکە کە گەورە بوو، ئەویش تۆ لە بیابان بەجێدێڵێت، هەر وەك چۆن تۆ دایکت بەجێهێشت!!!!

ئەم قسەیە زۆر کاری کردە سەر پیاوەکە، بۆیە وەڵامی خێزانەکەی نەدایەوە و سەری کز کرد!!! چونکە هەستی بەو تاوانە گەورەیە کرد، کە بەرانبەر بەدایکی کردوویەتی!!

خێرا ئەسپەکەی برد و گەڕایەوە شوێنەکەی پێشوویان، چونکە هەستی بەمەترسیی کرد لەسەر منداڵەکەی و دایکی، چونکە لە دوای ڕۆیشتنیان، ئاژەڵە دڕندەکانی ئەو ناوە، دەهاتن بۆ خواردنی پاشماوەی خێڵەکەیان!!!!!

پیاوەکە گەیشتە شوێنەکە، بینی دایکی، توند نەوەکەی بە سینگییەوە نووساندووە، لە ترسی ئەوەی دڕندەیەك بیخوات!!!!

کاتێـــك پیـــاوەکە ئەم هەڵوێســـتەی دایکـــی بینـــی، زۆر پێـــی داخبار(متأثر)بوو!! بۆیـە خێرا دایکی و کوڕەکەی خستە سەر ئەسپەکە و ناوچاوانی دایکی ماچ کرد و دەستی کرد بەگریان، چونکە هەستی بە شـەرمەزاری کـرد، هەمبـەر ئـەو کـارەی کـە بەرانـبەر دایکـی ئەنجـامی دابوو!!!!!

پاشـان گەڕانەوە نـاو خێڵەکەیـان ..لەو کـاتەوە بـۆ سـاتێکیش چـاوی لە چـاوی دایکـی لانەدەبرد، هەرکاتێـك خـێڵەکە بچوونـایە بـۆ شـوێنێکی تـر، پیاوەکە یەکەم کەس دایکی دەخستە سەر پشتی حوشترەکەی، هەروەهـا زۆر شانازی بە هاوسەرەکەیشییەوە دەکرد، چونکە بەو هەڵسوکەوتە جوانەی کە نواندی، وانەیەکی جوانی فێرکرد، کە هەرگیز بیری نەچێتەوە...

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- خراپـەکردن لەگـەڵ دایـك و بـاوك، هـەم لـە دونیـا، هـەمیش لـە قیامـەت دەبێتە پەڵەیەکی ڕەش بۆ منداڵەکانیان.
- نابێ مرۆڤ ببێتە بەشێك لـە کێشـە، بـەڵکو پێویسـتە مـرۆڤ هەمیشـە بەشێك بیت لە چارەسەر.
- نابێ گەنجەکان هەر ئێستایان لەبیر بێت، دەبێ بزانن لـە کـاتی منـداڵی، بە چ ئێش و ئازارێك گەورە کراون.
- ئەوەی چاڵێك بۆ کەسێکی دیکە لێبدات، خۆی دەکەوێتە ناوی.
- پێویسـتە مـرۆڤ دان بـە هـەڵی خـۆی دابنێـت و لـە ژیانـدا دووبـارەی نەکاتەوە.

## چیرۆکی

## (٣٧)

## دکتۆرێکی بێباک و پووڵ پەرست

شۆفێرێکی بەساڵاچوو، لە کاتێکدا کە کیژۆڵەیەکی بچووکی لە باوەش گرتبوو، بە خێرایی خۆی گەیاندە نەخۆشخانە و بە پەرستارەکەی گوت: تکا دەکەم، فریای ئەم کیژۆڵەیە بکەون، ئۆتۆمبێل لێی داوە و خەریکە گیانی دەردەچێت!!!!

پەرستارەکە گوتی: ئەم کچە حاڵی شڕە، پێویستی بە نەشتەرگەری خێرا هەیە، بەڵام دەبێ سەرەتا پارەکەی بدرێت، ئینجا نەشتەرگەری بۆ ئەنجام دەدرێت!!!

شۆفێرە بەساڵاچووەکە گوتی: ئێستا پارەم پێ نییە و دایك و باوکی ئەو منداڵەش ناناسم، بە دکتۆر بڵێ با نەشتەرگەرییەکەی بۆ بکات و لە مردن ڕزگاری بکات، هەر چۆنێك بێت پارەکەتان بۆ پەیدا دەکەم.

پەرستارەکە گوتی: ئێستا بە دکتۆری نەشتەرگەر دەڵێم، بزانم چی دەڵێت!

پەرستارەکە ڕووداوی ئەو کچەی بە دکتۆرەکەی ڕاگەیاند، بەڵام بەبێ ئەوەی دکتۆر سەیری کچەکە بکات، گوتی ئەمە یاسای نەخۆشخانەیە، تا پارەکەی نەدرێت، ناتوانین نەشتەرگەرییەکەی بۆ ئەنجام بدەین.

زۆری پێ نەچوو، کچەکە بەهۆی ئازارە زۆرەکانییەوە گیانی سپارد!!

ڕۆژی دواتر، دکتۆرەکە بە ماتی و غەمگینی لەسەر گڵکۆی کچە بچکۆڵانەکەی دانیشتبوو و بیری لەو هەڵەیە دەکردەوە، کە دوێنێ دەرهەق بەو کچەیە لە نەخۆشخانە ئەنجامی دابوو!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ پارە و پووڵ هێندە خۆشەویست بێت، شوێنی مرۆڤ بگرێتەوە، چونکە پارە قەرەبوو دەکرێتەوە، بەڵام مرۆڤ هەرگیز قەرەبوو ناکرێتەوە.
- ئەوەی مرۆڤ بۆ خۆی خۆشی دەوێ دەبێ بۆ کەسانی دیکەش خۆشی بوێت، ئەگەر دکتۆر بزانیبوایە کە کچی خۆیەتی تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بووە، ئەوا باشترین نەشتەرگەریی بۆ ئەنجام دەدات، بەڵام نەیزانی و تووشی ئەو جەرگسووتانە بوو!!!!!
- دەبێ مرۆڤ وەك شۆفێری ئۆتۆمبێلەکە، هەست بە بەرپرسیارەتی بکات و هەمبەر ڕزگارکردنی گیانی هەر مرۆڤێك کەمتەرخەمی نەکات.
- ................................................
- ................................................
- ................................................

## چیرۆکی

## (٣٨)

## بەسەرهاتی ئیمام شافعی و دزەکان

ئیمام شافعی هێشتا منداڵ بوو، کە باوکی ئەمری خوای کرد، دایکی ئیمام شافعی ئەرکی بەخێوکردن و سەرپەرشتیکردنی ئەوی گرتە ئەستۆ.

دایکی ئەم ئیمامە زۆر حەزی دەکرد کوڕەکەی فێری زانست و زانیاری بێت، بۆیە بڕیاریدا ڕەوانەی شاری مەدینە بکات، بۆ ئەوەی لای زانایانی ئەو شارە زانستی شەرعی فێر بێت.

بۆ ئەم مەبەستەش، بڕی(٦٠)دینار و هەندێ جلوبەرگ و کەلوپەل و خۆراکی بۆ ئیمام شافعی ئامادەکرد و پێی گوت: ڕۆڵەگیان لەگەڵ کاروانێك ڕەوانەی شاری مەدینەت دەکەم، بۆ ئەوەی لای زانایانی ئەو شارە فێرە زانستە شەرعییەکانی ببیت.

بەڵام ئامۆژگاریت دەکەم کە لە ژیانی خۆت دا، هەمیشە ڕاستگۆ بیت، چونکە ڕاستگۆیی لە هەموو تەنگ و چەلەمەیەك ڕزگارت دەکات.

دایکی شافعی، منداڵەکەی بە کاروانەکەی سپارد، شافعی کیسەی پارەکانی خستە گیرفانییەوە و لەگەڵ کاروانەکە بەرەو مەدینە بەڕێکەوت، لە ڕێ دز و جەردە و ڕێگرەکان، ڕێیان لە کاروانەکە گرت و کاروانەکەیان شەلاند!!

کاتێ لە شافعییان پرسی ها منداڵ، تۆ چیت پێ یە؟

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: ٦٠ دینارم پێ یە!!!

دزەکان وایان زانی ئەم منداڵە گاڵتەیان پێ دەکات، بۆیە خۆیان تێنەگەیاند و گەڕانەوە لای سەرۆکەکەیان لە ئەشکەوتەکە!

سەرۆکی دزەکان، ڕووی لە دزەکان کرد و پێی گوتن: هەموو کەلوپەلی کاروانەکەتان هێناوە؟

ئەوانیش گوتیان بەلێ قوربان، بەڵام منداڵێکیان لەگەڵ بوو، کاتێ لێمان پرسی چیت پێ یە؟ لە وەڵامدا گوتی ٦٠ دینارم پێ یە!! ئێمەش وامان زانی گاڵتەمان پێ دەکات، بۆیە خۆمان تێنەگەیاند و ڕەهامان کرد!!!!

ئەویش گوتی: بڕۆن هەر ئێستا ئەو منداڵەم بۆ بێنن!!

دزەکان چوون ئیمام شافعییان هێنایە لای سەرۆکی دزەکان!!!

سەرۆکی دزەکان لێی پرسی: ها پێم بڵێ چیت پێ یە؟

ئیمام شافعی: ٦٠ دینارم پێ یە!!

کوا پارەکانت؟ ئیمام شافعی دەستی بۆ کیسەی پارەکانی خۆی برد و لە گیرفانی خۆی دەرهێنا و خستییە ناو دەستی سەرۆکی دزەکان!!

سەرۆکی دزەکان، دەستی بە ژماردنی پارەکانی شافعی کرد و ٦٠ دیناری ژمارد!!!

که زانی منداڵەکە ڕاست دەکات! سەری سوڕما و پێی گوت: نازانم ئەتۆ شێتیت؟ چی وای لێکردی کە پارەکانت ئاشکرا بکەیت، لە کاتێکدا دەتزانی ئێمە دزین و پارەکەت بۆ خۆمان دەبەین؟!!!!

ئەویش گوتی: پێش ئەوەی بێمە سەفەر، دایکم ئامۆژگاری کردم و پێی گوتم: هەمیشە لە ژیانت دا ڕاستگۆ بە، چونکە ڕاستگۆیی لە تەنگ و چەلەمە ڕزگارت دەکات منیش بەڵێنم بە دایکم دابوو، تا مردن درۆ نەکەم، ئەمە وایکرد کە لەگەڵتاندا ڕاستگۆ بم!!!

سەرۆکی دزەکان واقی لەو قسەیە وڕما وگوتی: منداڵێك لەگەڵمان ڕاستگۆیە، کەچی خۆمان، لەگەڵ خۆمان و خوای خۆمان ڕاستگۆ نین!!!

بۆیە خۆی و دزەکان لەسەر دەستی ئیمام شافعی تەوبەیان کرد و بڕیاران دا، کە گشت کەلوپەلەکانی کاروانەکە بۆ خاوەنەکانیان بگەڕێننەوە و واز لە دزی و جەردەیی بهێنن!!!!!

**پەند و چیرۆکەکانی ئەم چیرۆکە:**

- ڕاستی تاڵە، بەڵام بەرهەمەکەی شیرینە!
- ڕاستی قورسە، بۆیە هەڵگرانی کەمن!
- ڕۆڵی دایك و باوك زۆر گرنگە لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان دا، چونکە منداڵ وەك پەڕێکی سپی وایە، چی لەسەری بنووسرێت، ئاوا دەخوێندرێتەوە!!
- ژیری بە گەورەیی و بچووکی نییە.
- زانست چرایە، لە تەنگانە باب و برایە!!
- داری ڕەوشتبەرزی، هەمیشە سەوز و بەردارە.
- ..........................................
- ..........................................
- ..........................................

## چیرۆکی

## (٣٩)

## مامۆستایەکی هەست بریندارکەر!!

مامۆستایەك، لە ناو پۆل، لە قوتابییەکی پرسی: باوکت چ کارێك دەکات؟
قوتابییەکە، نەیویست وەڵامی مامۆستا بداتەوە، بۆیە خۆی کڕ کرد!!
جارێکی دیکە، مامۆستاکە پرسیارەکەی دووبارە کردەوە: ها فلان کەس لەگەڵ تۆمە: باوکت کاری چییە؟
دیسان قوتابییەکە حەزی نەکرد پرسیاری مامۆستا وەڵام بداتەوە، بۆیە سەری کز کرد!!!!
ئەم جارە مامۆستا بە تووڕەییەوە لە ناو هاوپۆلییەکانی، بەسەریدا قیڕاندی و گوتی: ها گەمژە لەگەڵ تۆمە، باوکت چ کارێك دەکات؟!!!!
قوتابییەکە بە دڵێکی خەمبارەوە گوتی: وا لە ناو گۆڕەکەیدا.... خەوتووە!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مامۆستا وەك کەسێکی پەروەردەکار، نابێ هەستی قوتابی بریندار بکات.
- مرۆڤ نابێ پرسیارێکی وا بکات کە پەیوەندی بەخۆیەوە نەبێت.
- هەندێ جۆرە پرسیار هەیە، باشتر وایە مامۆستا لە ناو پۆل ئاراستەی قوتابی نەکات، بەڵکو بەتەنیا لێی بپرسێت.
- دەبێ مامۆستا قوتابییەکانی خۆی بناسێت و بزانێت چ کێشە و گرفتێکیان هەیە.

## چیرۆکی

(٤٠)

## هێشتا زیادکە

دکتۆرێکی نەشتەرگەریی ئێرانی، ئاوا بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە: لە نەخۆشخانەی فیروز ئابادی، یاریدەدەری دکتۆر موزەفەری بووم.

ڕۆژێك لە ڕۆژان، دکتۆر موزەفەری، لە ناکاو بانگی کردمە ژووری نەشتەرگەری و پیرە مێردێکی نیشان دام و پێی گوتم: قاچی ئەم پیرەمێردە بەهۆی هەوکردنەوە ڕەش بووە، بۆیە دەبێت ببڕدرێتەوە، ئەم کارەش بە تۆ دەسپێرم، من تەنیا چاودێری نەشتەرگەرییەکەت دەکەم.

من دەستم بە کارەکەم کرد و سەرەتا ئاماژەم بە پەنجەکانی قاچی ئەو پیرەمێردە کرد، بەڵام دکتۆری موزەفەری گۆتی هێشتان زیادکە، ئاماژەم بە گوێزنکی کرد، دکتۆرگوتی هێشتان زیادکە، ئاماژەم بە سەرەوەی ئەژنۆی کرد، گۆتی هێشتان زیادکە، تا گەیشتمە کۆتایی ڕانەکەی، ئینجا دکتۆر گوتی تا ئێرە ڕەش بووە، لەوێڕا بیببڕەوە!!!!!

دەستەواژەی هێشتان زیادکە، بیرەوەرییەکی تاڵی بە یاد هێنامەوە و لە خەیاڵم دا زیندوو کردەوە!!

کاتی خۆی لە ساڵانی قاتی و قڕی، لە گەڕەکی پامنار دەژیاین..

برسیێتی تەنگی بە خەڵکی هەڵچنی بوو!!!

هەندێ جووتیاری چاوچنۆکی لە خوا غافل، ئەو بارودۆخەیان قۆزیووە و گەنمیان دە قات گرانتر دەفرۆشت و قۆڵی خەڵکیان دەبڕی!!!

شەوێك باوکم، دەستی گرتم و پێکەوە چووینە لای دراوسێکەمان، کە جووتیارێك بوو و گەنم و جۆی دەفرۆشت!!!

بۆ ئەوە چوو بووین تا کەمێك گەنم یان جۆمان پێ بفرۆشێت، بۆ ئەوەی لە دەردی برسێتی ڕزگارمان بێت.

باوکم هەر نرخێکی ب گوتبایە، ئەو جووتیارە دەیگوت: هێشتان زیادکە، هێشتان زیادکە.

کاتێ ئەو پیرەمێردە بە هۆش خۆی هاتەوە، چوومە لای، هەستم کرد ئەو پیرەمێردە ئاشنایە!!!

کاتێ لێم پرسی: خەڵکی کوێیت؟

گوتی: خەڵکی پامنار بووم.

گوتم :کارت چی بوو؟

گوتی: جووتیار بووم، گەنم و جۆم دەچاند و دەفرۆشت.

ئیدی بۆم دەرکەوت، هەمان ئەو جووتیارە بووە کە بە باوکمی دەگوت هێشتان زیادکە، هێشتان زیادکە!!!!! ئیدی تاقەت ئەوەم نەبوو زیاتر گوێ لە قسەکانی بگرم.

بەڵام قەت بە خەیاڵم دا نەهاتبوو، کە بە چاوی خۆم ببینم کە هەر لە دونیا، خوا تۆڵەمان لەو جووتیارە ستەمکارە بکاتەوە!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ چی بچێنێت، ئەوە دەچنێتەوە.
- خوا، زوو یان درەنگ، هەقی ستەملێکراو لە ستەمکار دەکاتەوە.
- بێ ویژدانی و چاوچنۆکی سەری ساحیبی دەخوات.
- نابێ مرۆڤ هیچ بارودۆخێك بقۆزێتەوە، بۆ ئەوەی قۆڵی خەڵك ببڕێت، چونکە ڕۆژان، ڕۆژانی لە دوایە، ئەگەر لە دەرگای کەسێکت دا، مسۆگەر لە دەرگات دەدرێتەوە.....
- ...............................................
- ...............................................
- ...............................................

## چیرۆکی

## (٤١)

## کچێکی سێوی(بێ دایک)

مامۆستایەك، هەموو جارێ لەناو پۆلدا، کچە قوتابییەکی پۆلی سێی بنەڕەتی هەڵدەستاندە سەر تەختە و لەبەر چاوی هاوپۆلییەکانی، سەرزەنشتی دەکرد و پێی دەگوت: نازانم بۆچی دایکت گرنگیت پێنادات و هەمیشە بە جلی پیس و نارێکەوە دەتنێرتە قوتابخانە؟!!!!

ئەو مامۆستایە دڵڕەقە، وەك سزایەك، هەموو ڕۆژێ دوو داری لە پەنجە ناسکەکانی کچە سێوییەکە دەدا!! ئەویش، چاوەکانی پڕ دەبوون لە فرمێسك و بە کوڵ دەگریا!!!!

کچەکە ڕۆژێك بێزار بوو و چووە سەر گۆڕی دایکی وگوتی:" دایکە گیان! لەگەڵم وەرە قوتابخانە، هەمیشە مامۆستا لێم دەدات و لەناو هەموو قوتابییەکاندا دەمگریەنێت و پێم دەڵێت:"دایکت زۆر خەمساردە و قەت ئاگای لە تۆ نییە"!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مامۆستا، وەك کەسێکی فێرکار و پەروەردەکار، نابێ قوتابییەکانی خۆی بشکێنێتەوە، نەخاسمە لە ناو هاوپۆلییەکانیدا.
- ئەگەر یەکێك لە قوتابییەکانی مامۆستا، کێشەیەکی هەبوو، دەبێ مامۆستا هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو کێشەیە بدۆزێتەوە، بۆ ئەوەی چارەسەرەکەی ئاسان بێت.
- پێویستە مامۆستا لەگەڵ قوتابییەکانی دۆست و هاورێ بێت، بۆ ئەوەی نهێنییەکانی خۆی بە مامۆستا بڵێن.
- دەبێ مامۆستا ڕقی لە کاری خراپە بێت، نەك کەسی خراپەکار!!!
- پێویستە پەیوەندی مامۆستا وماڵی قوتابی پتەو بێت، بۆ ئەوەی بزانێت قوتابی لە ماڵەوە چ کێشەیەکی هەیە!!!!
- ................................................
- ................................................
- ................................................

## چیرۆکی

## (٤٢)

## بەسەرهاتی ئەندازیارێک و کارگەرێک

ڕۆژێك ئەندازیارێك، لە نهۆمی شەشەمی باڵەخانەیەك، ویستی قسە لەگەڵ یەکێك لە کارگەرەکانی بکات لە نهۆمی خوارەوە!!

زۆرگازی دەکات، بەڵام بەهۆی سەرقاڵی و هاژەهاژەوە، گوێبیستی نابێت.

ئەندازیارەکە ناچار دەبێت ١٠ دۆلار فڕێ بداتە خوارەوە، بۆ ئەوەی کارگەرەکە بەخەبەر بێتەوە و سەیری سەرەوە بکات!!

کارگەرەکە، بەبێ ئەوەی سەیری سەرەوە بکات، ١٠ دۆلارەکەی هەڵدەگرێتەوە و دەیخاتە گیرفانییەوە و لەسەر کارەکەی بەردەوام دەبێت.

جاری دووەم ٥٠ دۆلاری فڕێ دایە خوارەوە.

دووبارە کارگەرەکە، بەبێ ئەوەی سەیری سەرەوە بکات، ٥٠ دۆلارەکەی هەڵدەگرێتەوە و دەیخاتە گیرفانییەوە و لەسەر کارەکەی بەردەوام دەبێت.

جاری سێیەم، ئەندازیارەکە بەردێکی بچووك فڕێدەداتە خوارەوە، بە سەری کارگەرەکە دەکەوێت، خێرا سەر هەڵدەبڕێ و سەیری سەرەوە دەکات، ئەندازیارەکە کارەکەی خۆی پێ دەڵێت!!!!!!

ئەم بەسەرهاتە، بەسەرهاتی ژیانی مرۆڤەکانە لەسەر زەوی!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ لەم ژیانەدا، وەك ئەو کارگەرە وایە، لە زۆر ناز و نیعمەتی گەورە بەهەرەمەندە و هەر ئاگاشی لێی نییە، بەڵام کاتێ قاچی دەخلیسکێ، یان سەری دەئێشێ، ئیدی یەکسەر ڕوو لە ئاسمان دەکات و لە خوا دەپاڕێتەوە!!!!
- پێویستە مرۆڤ لە خۆشی و نەخۆشی و شینی و شادیدا خودای لە بیر بێت و لە خودا غافل نەبێت.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٤٣)

## بەسەرهاتی پاشایەک و پیرەژنێک

پاشایەك هەبوو! حەزی لە ناوبانگ و ڕیابازی بوو، بۆ ئەم مەبەستەش بڕیاریدا لەسەر ئەرکی خۆی و بەبێ بەشداریکردنی خەڵکی دیکە، مزگەوتێك دروست بکات و خەرجییەکانی ئەو مزگەوتە بگرێتە ئەستۆی خۆی!!!!

دوای تەواوبوونی مزگەوتەکە، جەنابی پاشا ناوی خۆی لەسەر مزگەوتەکە هەڵواسی!!!

بەڵام شەوێك لە شەوان، خەونێکی بینی، لە خەونەکەیدا دیتی کەوا فریشتەیەك لە ئاسمان دابەزی و ناوی ئەوی لێکردەوە و ناوی پیرەژنێکی لەسەر مزگەوتەکە هەڵواسی!!!!

بەیانی، بە حەپەساوی لە خەو هەستا!!! هەر زوو دوو لە پاسەوانەکانی خۆی ناردە مزگەوتێ، بۆ ئەوەی بزانن ئاخۆ ناوەکەی لەسەر مزگەوتەکە ماوە یان نا..!!!!!!

پاسەوانەکان، فەرمانی پاشایان جێبەجێکرد و هاتنەوە و گوتیان: قوربان ناوی تۆ لەسەر مزگەوتەکە ماوە!!!

شەوی پاشتر، دیسان هەمان خەونی بینییەوە!!!

بەیانی زوو بە شەپرزەیی لە خەو هەستایەوە، دیسان پاسەوانەکانی خۆی ناردەوە، بۆ ئەوەی بزانێت کەوا ناوی لەسەر مزگەوتەکەی ماوە یان نا..!!!!

پاسەوانەکان چوون و سەیری مزگەوتەکەیان کرد وگەڕانەوە وگوتیان: قوربان، ناوی تۆ لەسەر مزگەوتەکە ماوە!!!!

شەوی دواتر، بۆ جاری سێیەم لەسەر یەك، جەنابی پاشا هەمان خەونی دیتەوە و لە خەودا ناوی ئەو پیرەژنەی ئەزبەرکردبوو، کە لە خەوێدا بینیبووی ناوی لەسەر مزگەوتەکە هەڵواسرابوو.

بۆیە کە بەیانی هەستایەوە، هەر زووگازی پاسەوانەکانی کرد وگوتی: پیرەژنێك بەم ناوە لەم شارە هەیە، سۆراغی بکەن و بووم بدۆزنەوە!!!!

دوای گەڕان و سووڕانێکی زۆر، دواجار پیرەژنەکەیان دۆزییەوە و هێنایانە خزمەت پاشا!!!

جەنابی پاشا پرسیاری لە پیرەژنەکە کرد و پێی گوت: بە چ شتێك بەشداریت لە دروستکردنی ئەو مزگەوتەدا کردبوو؟

پیرەژنەکەش گوتی: جەنابی پاشا، پیرەژنێکی بەساڵاچووی لەڕ و لاوازی هەژاری دەستکورتی وەك من، دەبێ چ ڕۆڵێکی هەبێت لە دروستکردنی ئەو مزگەوتەدا، لە کاتێکدا، جگە لە خۆت، نەدەهێشتبوو هیچ کەسێك بەشدار بێت لە دروستکردنیدا..!!!!!

پاشایەکە بە پیرەژنەکەی گوت: تۆخوا چ ڕۆڵێکت لە دروستکردنی ئەو مزگەوتەدا هەبووە، کە وای کرد ناوم بسڕنەوە و ناوی تۆی لەسەر بنووسن؟!!

پیرەژنەکەش گوتی: بەخوا هیچ ڕۆڵێکم نەبووە، جگە لە....

پاشایەکە گوتی: جگە لە چی؟!!!!!

پیرەژنەکە گوتی: جارێکیان، بە کن مزگەوتەکەدا تێدەپەڕیم، ئەسپێکم بینی، کە باری بۆ مزگەوتەکە هێنابوو، بە دارێکەوە بەسترابووە، تینوویەتیش زۆری بۆ هێنابوو، سەتلێکی ئاویش لێی نزیك بوو، بەڵام نەدەگەیشتە ئاوەکە!!

منیش دڵم پێی سووتا و ئەو سەتڵە ئاوەم لە ئەسپەکە نزیك کردەوە، بەو شێوەیە تێر ئاوی خواردەوە و لە تینوویەتی ڕزگاری بوو!!!!!

پاشایەکە گوتی: ئێستا نهێنیی ئەو خەونەم زانی، کارەکەت بۆ خوا بوو، بۆیە خواش لە تۆی قبوول کرد، بەڵام کارەکەم بۆ خوا نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوە بوو تاکو بڵێن: ئەم مزگەوتە هی پاشایە و پاشا دروستی کردووە!!!!!

بۆیە لێت پیرۆز بێت و بڕیاریشدا، کەوا ناوی خۆی لێبکاتەوە و ناوی ئەو پیرەژنە لەسەر مزگەوتەکە هەڵبواسێت!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هەر کەسێك لەگەڵ خوا ڕاست نەکات، ڕووڕەش و شەرمەزار دەبێت.
- کارێکی کەم، بەڵام بە ئیخلاسی، باشترە لای خوای گەورە، لە کارێکی فرە زۆر، بەڵام تێکەڵ بێت بە شیرك و ڕیابازی، بۆیە گوتراوە:(چاکە بکە و بیدە بە ئاوا، کەسیش نەیزانێ، لای خوا نووسراوە)!!!!
- نابێ مرۆڤ خۆپەرست بێت و هەر تەنیا خۆی گەرەك بێت.
- هەندێ خەون هەیە، ڕاستن، بۆیە دەبێ مرۆڤ پەندی لێ وەربگرێت.
- نابێ مرۆڤ هیچ خێر و چاکەیەکی کەم، بە کەم بزانێت، چونکە ڕەنگە لە تەرازووی پەروەردگاردا، زۆر قورس و سەنگین بێت.
- دەبێ مرۆڤ بە سۆز و میهرەبان بێت، تەنانەت لەگەڵ گیانەوەر و ئاژەڵەکانیشدا.

## چیرۆکی

## (٤٤)

## تاقیکردنەوەیەکی سەخت

موسڵمانێکی دانیشتووی شاری لەندەن، ئاوا بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە:

ڕۆژێك سواری تاکسییەك بووم، لە ڕێ، پارەی شۆفێرەکەم دا،کابرای شۆفێر، ٢٠ (پێنس)ی زیاد لە باقی پارەکەم بۆ گێڕاندمەوە، بیرم کردەوە، ئاخۆ ئەو ٢٠ (پێنس)ە بیخەمە ناو گیرفانمەوە، یاخود بۆ شۆفێرەکە بگەڕێنمەوە، دوای بیرکردنەوەیەکی قووڵ، بەسەر هەستە نەرێنییەکەمدا زاڵ بووم و بڕیارم دا ٢٠ (پێنس)ە زیادەکە بۆ شۆفێرەکە بگەڕێنمەوە.

بۆیە بە شۆفێرەکەم گوت: ئەم ٢٠(پێنس)ە، هی خۆتە و بە هەڵە بە منت داوە!!!!

کاتێ گەیشتینە شوێنی مەبەست، خواحافیزیم لە شۆفێرەکە کرد، بەڵام پێش ئەوەی شۆفێرەکە بەڕێ بکەوێت، گوتی: سوپاس بەڕێز.

گوتم بۆچی سوپاسم دەکەیت؟

گوتی: من بڕیارم دابوو بەیانی بێمە مەڵبەندەکەتان موسڵمانبوونی خۆم ڕابگەیەنم، بەڵام کە تۆ سواری ئۆتۆمبێلەکەم بووی، لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەم موسڵمانە تاقی دەکەمەوە، ئاخۆ دەستپاکە یان نا، گوتم مەرج بێت،

ئەگەر دەستپاك بوو، ئەوا دەچم موسڵمان دەبم، ئەگەر دەستپاك نەبوو، ئەوا هیچ!!!

کاتێ شۆفێرەکە ڕۆیشت! هەموو قاڵبم تێکچوو!!!

بیرم لەو ساتە کردەوە کەوا هێندە نەمابوو، ئیسلام بەو ٢٠ (پێنس)ە بفرۆشم!!!!!!!

ئاخۆ دەبێ چەند کەسی موسڵمان، بە ڕەفتارە ناشیرینەکانی، بە بەڵێنە ناڕاستەکانی، بە زمانە پیسەکەی، ئیسلامی فرۆشتبێت و لەبەر چاوی خەڵکی ڕەش کردبێت!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- پێویستە مرۆڤ هەمیشە لە ئاست ئەو بەرپرسیارێتییە دابێت، کە لە ئەستۆی دایە.
- پێویستە مرۆڤ هەموو کاتێ کەسێکی دەستپاك بێت و نموونەی دەستپاکی بێت، بۆ ئەوەی خەڵکی دیکە چاوی لێ بکات.
- زۆر جار ڕەفتار یان گوفتار یان کردارێکی جوان یان ناشیرین، ڕاستەوخۆ کاریگەریی هەیە لەسەر ئەو بیروباوەڕەی کە مرۆڤ لە ژیانی خۆیدا پەیڕەو دەکات.
- پێویستە مرۆڤ لەگەڵ ئەو مەبدەء و بیروباوەڕە ڕاستگۆ بێت کە بانگەشەی بۆ دەکات.
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٤٥)

## جووتیارێکی ژیر و سەرمایەدارێکی لەخۆبایی

جووتیارێکی ژیر، خەریکی کشتوکاڵ و گەنم چاندن بوو، سەرمایەدارێکی لەخۆبایی بە لایدا تێپەڕی، بە فیزەوە پێی گوت: ها... تۆ بچێنە! لە تۆ چاندن، لە ئێمەش خواردن!!!

جووتیارە ژیرەکەش، سەیرێکی سەرمایەدارە لەخۆباییەکەی کرد و وەڵامێکی پڕ پێستی دایەوە و پێی گوت: خەریکم جۆ دەچێنم!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ پارە و پووڵ یان سەروەت و سامان یان پۆست و پلە و پایە، ببنە هۆکاری لووتبەرزی مرۆڤ.
- نابێ مرۆڤ بە چاوێکی کەم سەیری کەسانی دیکە بکات.
- پێویستە مرۆڤ سنووری خۆی بزانێت، بۆ ئەوەی مافی کەسانی دیکە پێشێل نەکات.
- پێویستە مرۆڤ ڕێز لە کاری کەسانی دیکە بگرێت، بەتایبەتی کار و کەسابەتی حەڵاڵ.
- ..........................................
- ..........................................

## چیرۆکی

## (٤٦)

## منداڵێکی دەستفرۆش

وێنەکێشێك، وێنەی کچێکی بچکۆڵەی دەستفرۆشی گرت، کە لە ژێر ڕێژنەی باراندا دەستفرۆشی دەکرد.

- ئەو وێنەیە بوو بە باشترین وێنەی ساڵ!!

- وێنەگرەکەش بوو بە باشترین وێنەگری ساڵ!!!

- پەرتووکێك لەبارەی ئەو وێنەیەوە هاتە نووسین، پەرتووکەکە بۆ بە باشترین پەرتووکی ساڵ و نووسەری پەرتووکەکەش خەڵاتی وەرگرت!!!

- فیلمێك لەسەر ئەو وێنەیە هاتە دروست کردن، ئەو فیلمەیە بۆ بە پڕ بینەرترین فیلم و هەموو ئەوانەش کە بەشدار بوون لە دروستکردنی ئەو فیلمەدا، دەستخۆشییان لێکرا و خەڵاتیان وەرگرت، بەڵام ئەو منداڵە بچکۆڵەیە، کە کاری دەستفرۆشی دەکرد، ئێستاش هەر خەریکی دەستفرۆشییە!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- زۆر جار کەسێك ڕەنج دەدات، کەسێکی دیکە ڕەنجەکەی دەخوات!!!!
- مخابن! هەژارەکان لە پێش چاوەکان نین و زۆر جار وەك مرۆڤ قەدریان ناگیرێت و نازاندرێت!!!
- ئەم دونیایە پڕە لە ستەم و نادادپەروەری، بە تایبەتی لە نێوان: ڕەش و سپی، هەژار و دەوڵەمەند، وەزیر و گزیر، بەهێز و بێهێز، گەورە و بچووك، نێر و مێ و....تاد..!!!
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (٤٧)

## پیاوێکی جوامێر

کەسێك هاتە لای پیاوێکی جوامێر و پێی گوت: هاتووم بۆ ئەوەی کراسەکەتم بدەیتێ، بۆ ئەوەی وەك تۆ ببم بە کەسێکی جوامێر!!!

پیاوە جوامێرەکەش گوتی: ئایا ژنێك، کراسی پیاوان لەبەر بکات، دەبێتە پیاو؟!!!

پیاوەکە گوتی: نەخێر!!!

دیسان پیاوە جوامێرەکە گوتی: ئایا پیاوێك،کراسی ژنێك لەبەر بکات، دەبێتە ژن؟!!!

پیاوەکە گوتی: نەخێر!!!

ئینجا پیاوە جوامێرەکە گوتی: کاکەگیان، کەوابێ تۆش بە کراسەکەم نابی بە پیاوێکی جوامێر، چونکە جوامێری، بە ڕەفتار و کرداری جوامێرانەیە، بە کراس نییە، کورد وتەنی:(بە ئیشە، بە ڕیش نییە)!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- جوانیی مرۆڤ بە ڕەوشتە، بە کەشخەیی نییە.
- سەرچاوەی جوانی و پاکی مرۆڤ، بریتییە لە دڵێکی پاك و زمانێکی چاك و کردارێکی ڕاست، نەك کراس و قات و ڕیبات!!!!
- پێویستە مرۆڤ لاسایی کردارە باشەکان بکاتەوە، نەك جلی جوان و کەشخە.....
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (٤٨)

## وشەیەکی خێر، ئەسیرێک ڕزگار دەکات

پاشایەك، ویستی ئەسیرێك بکوژێت، ئەسیرەکە، کە هیچ ئومێدێکی بە ژیان نەمابوو، لە ژێر لێوەکانییەوە هەندێ جوێنی بە پاشا دا..!!!!

پاشا بە یەکێك لە وەزیرەکانی خۆی گوت: ئەو ئەسیرە چیی دەڵێ؟

وەزیرەکە گوتی: جەنابی پاشا، ئەسیرەکە دوعای خێرتان بۆ دەکات و ئومێدی وایە لێی ببۆریت!!!

وەزیرێکی دیکە، لە دیوانی پاشا ئامادەبوو و کێشەی لەگەڵ وەزیری یەکەم هەبوو، گوتی: جەنابی پاشا، ئایا دەزانی ئەو ئەسیرە جوێنی بە تۆ دەدا؟

جەنابی پاشا گوتی: تۆ ڕاست دەڵێیت، بەڵام درۆی ئەو وەزیرە کە گیانی کەسێك لە مردن ڕزگار دەکات، باشترە لە ڕاستییەکەی تۆ، کە دەبێتە هۆی کوشتنی مرۆڤێك!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- تا قسەی خێر هەیە، هیچ کاتێ پەنا بۆ قسەی شەڕ نەبە، چونکە شەڕ هیچ کاتێ چارەسەر نییە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان.
- لە کاتی سەرهەڵدانی کێشە لە نێوان دوو کەس یان دوو لا، هەوڵدە هۆکاری سازان بە، نەك لێکترازان، هۆکاری ئاشتی و خێر بە، نەك شەڕ، هۆکاری ڕزگارکردن بە، نەك لەناوبردن!!!
- مرۆڤی چاك، هەمیشە چاوەڕوانی چاکەی لێ دەکرێت، مرۆڤی شەڕخوازیش، هەمیشە چاوەڕوانی شەڕ و فیتنە و دووبەرەکیی لێ دەکرێت.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆكی
## (٤٩)
## شێرێكی لەخۆبایی

شێرێكی برسی، لەناو كێوەكان خۆی مەلاس دابوو! لەناكاو، گایەكی بینی، چرك و تیژ، هەڵمەتی بۆ برد و گایەكەی لەت و پەت كرد و خواردی!
بەڵام چەند جار بە كەڵبەكانی، گۆشتەكەی لێدەكردەوە، مەستانە نەعرە و نەڕەی دەكرد و شانازی بە خۆیەوە دەكرد، ڕاوچییەك، لەوێ دەگەڕا و دەسووڕایەوە و بۆ ڕاوكردنی ئاژەڵە كێوییەكان هاتبوو ئەو ناوە، كاتێ گوێبیستی نەعرەی شێرەكە بوو، نیشانەی لێ گرت و كوشتی!!

**پەند و ئامۆژگارییەكانی ئەم چیرۆكە:**

- نابێ مرۆڤ لە سەركەوتنەكاندا لەخۆبایی ببێت.
- مرۆڤ ژیر لە كاتی سەركەوتنیشدا نابێ لە دوژمنی خۆی غافل بێت.
- مرۆڤ هەر چەند بەهێز بێت، كەسێكی لە مرۆڤ بەهێزتر هەیە، بۆیە نابێ لەخۆبایی بێت.
- ................................................
- ................................................
- ................................................

## چیرۆکی

## (٥٠)

## دەردی نەزانین

لە میوانداریيەك، پیرەمێردێك، ویستی بچێتە دەرەوە، بەڵام کاتێ هەستا سەرپێ، گۆچانەکەی عەکس کردەوە! بنەکەی بەدەستەوە گرت و سەرەکەی خستە سەر زەوی!!!

ئەوانەی لەو کۆڕ و دیوەخانە ئامادەبوون، پێیان وابوو، ئەو پیرەمێردە خەڵەفاوە و هەست و عەقڵی نەماوە، بۆیە گۆچانەکەی سەرەو ژێر بەدەستەوە گرتووە و بە هاوسەنگی ناتوانێ ڕێ بکات!!!

بۆیە هەمووان پێی پێکەینن و پێیان گوت: بۆچی گۆچانەکەت ئاوا گرتووە؟

پیرەمێردەکە لەسەرەخۆ و بە ئارامی وەڵامی دانەوە و گوتی: چونکە بنی گۆچانەکەم پیس بوو!! بۆیە نەمویست فەرشی ئەم ماڵە پیس بکەم!!!!!

ئەم قسەیە، هەمووانی شەرمەزار و بێدەنگ کرد!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤی مەزن و بەساڵاچوو، شایانی ڕێزگرتنە، نەك گاڵتەپێکردن.
- مرۆڤی بەتەمەن و ئەختیار، کەسێکی دونیا دیدە و گەڕیدەیە، بۆیە دەبێ مرۆڤ سوود لە ئەزموونی ئەو جۆرە کەسانە وەربگرێت.
- ئەگەر مرۆڤ لە کانییەك ئاوی خواردەوە، نابێ بەردی تێ بگرێت.
- ئەگەر مرۆڤ نهێنی کارێك نەزانێت، نابێ لەخۆڕا بڕیاری لەسەر بدات.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی

## (٥١)

## تاقیکردنەوەیەکی گرنگ

ڕۆژێك، مامۆستایەکی زانکۆ، ویستی خوێندکارەکانی خۆی تاقی بکاتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش، هەر خوێندکارێك، دەبدەبەیەك و دەرزییەکی دایە دەست و پێی گوتن: ئێوە تەنیا یەك خولەك دەرفەتتان لە پێشە، بۆ ئەوەی هەر کام لە ئێوە دەبدەبی ئەویتریان بتەقێنێتەوە!!!

بەڵام هەر کەسێ لە ئێوە، توانیشی لە ماوەی ئەو خولەکەدا دەبدەبەکەی لە تەقین بپارێزێ، ئەوا خەڵاتی دەکەم!!!!

کێبڕکێیەکە دەستی پێکرد، دوای تەواوبوونی ئەو خولەکە، تەنیا ٥ کەس توانییان دەبدەبەکەیان بپارێزن و نەهێڵن بتەقێتەوە.

ئینجا مامۆستایەکە ڕووی لە گشت خوێندکارەکانی کرد و گوتی: من هەمان کێبڕکێم لە پۆلێکی دیکەش ئەنجام دابوو، بەڵام هەموو خوێندکارەکانی ئەو پۆلە براوە بوون، چونکە توانییان دەبدەبەکانیان لە تەقاندنەوە بپارێزن!!!!!

هەروەها مامۆستایەکە گوتی: (ئێمەی مرۆڤ، دوژمنی یەکتری نین، تا هەندێ براوە و هەندێ دۆڕاو بین.

بۆیە نابێ بەختەوەری خۆمان لەسەر حیسابی بەدبەختی ئەوانی دیکە دەستەبەر بکەین)!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هەندێ کەس بۆ بیناکردنی خۆیان، ئەوانی دیکە دەڕووخێنن!!
- مرۆڤی ژیر، لە جیاتی ئەوەی ئەوانی دیکە بشکێنێ، پێویستە خۆی ڕاستکاتەوە!!!
- مخابن، زۆربەمان هێندەی کار لەسەر خاڵە لاوازەکانی خەڵك دەکەین، نیو ئەوەندە کار لەسەر بەرجەستەکردنی خاڵە بەهێزەکانمان ناکەین.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٥٢)

## دەستێکی میهرەبان

لە یەکێك لە دێهاتەکان، مامۆستایەکی بنەڕەتی، داوای لە قوتابییەکانی کرد، کەوا وێنەی ئەو شتە، یان کەسەی بۆ بکێشن، کە لای ئەوان زۆر بەنرخ و بە بەهایە!!!

ئەو مامۆستایە، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: حەتمەن ئەم منداڵانە وێنەی سفرە و مریشك و مێزێك دەکێشن!!!

بەڵام کاتێ یەکێك لە قوتابییەکانی، وێنەیەکی دەستێکی سادە و ساکاری دروست کرد و دایە دەست مامۆستایەکەی!!

مامۆستایەکەی تووشی شۆك بوو!!!

نەیزانی ئەمە دەستی چ کەسێکە؟

یەکێك لە منداڵەکان دەستی بەرزکردەوە گوتی: هەست دەکەم ئەمە دەستی باوك بێت، کە بەخێومان دەکات!

یەکێکی دیکە گوتی: هەست دەکەم دەستی جووتارێك بێت، کە گەنم مان بۆ دەچێنێت!

مامۆستایەکە لەسەر سەری ئەو قوتابییە وەستا و لێی پرسی: کچم ئەو دەستە، دەستی چ کەسێك بوو؟

کچەکە گوتی: مامۆستا خاتوون، ئەو دەستە، دەستی تۆیە!!!!

ئینجا بیری کەوتەوە کە کاتی خۆی ئەو کچە دایك و باوکی لەدەست دابوو، ئەو زۆر جار دەچوو ماڵیان، دەستی بەسەریدا دەهێنا و سۆز و خۆشەویستی خۆی پێ دەبەخشی!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- چاکە بە چاکەیە، ئەوەی چاکە دەکات، چاکەکەی قەت ون نابێت و زوو یا درەنگ بەرهەمی چاکەکەی دەچنێتەوە.
- نابێ مرۆڤ سپڵە بێت و چاکەی هیچ کەسێك لەبیر بکات.
- مامۆستای دڵسۆز و باش، ئەگەر سۆز و خۆشەویستی خۆی بە قوتابی دایك مردوو و باوك مردوو ببەخشێت، تا ئەندازەیەکی زۆر دەتوانێ تۆزێك لەو کەلێنە پڕ کاتەوە، کە دایك و باوکی ئەو قوتابییە لە دوای خۆیان دروستیان کردووە!!!!
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (٥٣)

## پیرەژنێکی ژیر

بازرگانێك، سەفەری وڵاتی (چین) دەکات و ئاوا بەسەرهاتی خۆی و پیرەژنێکی کەنناسی ئەو وڵاتە دەگێڕێتەوە:

لە وڵاتی(چین) بووم، لە یەکێك لە شەقامەکانی شاری(پەکین)ی پایتەختی ئەو وڵاتە، ژنێکی بەساڵاچووم بینی، خەریکی پاککردنەوەی شەقامەکە بوو، پشوویەکی دا و لە شوێنێك پاڵی دایەوە و کتێبێکی دەرهێنا و خەریکی خوێندنەوەی کتێبەکە بوو!!!!

ئەم دیمەنە زۆر سەرنجڕاکێشم و لە دڵی خۆمدا گوتم، پیرەژن و کتێب خوێندنەوە، کوجا مەرحەبا...!!!!

بۆیە خۆم لێی نزیك کردەوە و بە زمانی چینی پێم گوت: تۆ هەم پیرەژنیت، هەمیش ئیشی کەنناسی دەکەیت، چیت داوە لە کتێب خوێندنەوە؟ !!!

وەڵامێکی پڕ پێستی منی دایەوە و گوتی: بە خوێندنەوەی من، وڵاتەکەم پێشدەکەوێت!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ هەر لە ناو بێشکە، تا ناو گۆڕ، دەبێ خەریکی بەدەستهێنانی زانست و زانیاری بێت، چونکە وتراوە ئەوەی لە بیری زانست نەخواتەوە، لە بیابانی نەفامی و نەزانیدا، بە تینوویێتی دەمرێت!!!!
- خوێندن هێما و نیشانەی پێشکەوتنی وڵاتانە.
- نابێ کار ڕێگر بێت لە خوێندن و فێربوون و خۆتێگەیاندن و خۆپێگەیاندن.
- وڵات پێویستی بە توانای هەموو مرۆڤێکە، هەر لە منداڵێکەوە بگرە، تا پیر و پەککەوتەیەك.
- کتێب باشترین هاوڕێ یە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٥٤)

## ڕووخاندن ئاسانە، بەڵام بیناکردن گرانە

شاگردێك، چەندین ساڵ دەچێتە لای نیگارکێشێکی مەزن، تا خۆی فێرە نیگارکێشی بکات.

دوای چەندین ساڵ، بەجوانی فێرە هونەری نیگارکێشی دەبێت، بۆیە مامۆستاکەی پێی دەڵێت: تۆ ئیتر نیگارکێشێکی کارامە و لێهاتوویی، من لەمە زیاتر هیچی ترم پێ نییە کە فێرت کەم.

شاگردەکەش، وا هەست دەکات کە ئیتر بووە بە نیگارکێشێکی مەزن، بۆیە بڕیاری دا لەمەودوا بە تەنیا کاری نیگارکێشی بکات.

بۆ سەلماندنی دەست ڕەنگینی خۆی، هەستا نیگارێکی زێدە جوانی کێشا و بەیانی زوو ڕۆیشتە شار و لە ناوەندی شار هەڵیواسی!

قەلەمێك و کەمێك ڕەنگیشی لای ئەو نیگارە دانا و لەسەر تابلۆیەك ئەم داواکارییەی نووسی و داوای لە ڕێبواران کرد کەوا:(هەر کەسێك ڕەخنەیەکی لە نیگارەکە هەیە، با نیشانەی(×)، لەسەری دابنێت)!!!

ئێوارێ، کاتێ نیگارکێشە گەنجەکە گەڕایەوە، بینی هەموو نیگارەکە بووە بە(×)، زۆر خەمگین و دڵتەنگ بوو و هەستی بە بێتاقەتی کرد!!!!

بۆیە هەستا سەردانی مامۆستای خۆی کرد و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

ماموٚستاکەیشی پێی گوت: ئایا دەتوانی نیگارێکی دیکەم بۆ بکێشی، کە وەك هەمان نیگاری یەکەم بێت؟!!

شاگردەکە گوتی: بەلێ.

شاگردەکە دەستی بە کێشانی نیگارێکی دیکە کردەوە و لە کارەکەی تەواو بوو و دایە دەست ماموٚستایەکەی.

ماموٚستای شاگردەکە بە خۆی، نیگارەکەی بردە هەمان شوێنی یەکەم و لە ناوەندی شار هەڵیواسی، ئینجا قەڵەمێك و ڕەنگێکی تایبەتی لای نیگارەکە دانا، بەڵام ئەم جارە دروشمی سەر تابلۆیەکەی گۆڕی و لەسەری نووسی:(هەر کەسێك ڕەخنەیەکی لەم نیگارە هەبێت، با بەم قەڵەم و ڕەنگە، ڕاستی کاتەوە).

ئێوارێ بە خۆی و شاگردەکەی، سەردانی شوێنەکەیان کردەوە، بینییان نیگارەکە هەر وەك خۆی ماوەتەوە و هیچ کەسێك دەستی لێ نەداوە!!!

ئینجا ماموٚستاکە، حیکمەتی ئەم کارەی بۆ شاگردەکەی شیکردەوە و گوتی: (هەموو مرۆڤەکان توانای ڕەخنەگرتنیان هەیە، بەڵام توانای ڕاستکردنەوەیان نییە)!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هەمیشە ڕووخاندن ئاسانە، بەڵام بیناکردن گرانە، بۆیە هەموو کەسێك دەتوانێ بەشدار بێت لە ڕووخاندن، بەڵام هەموو کەسێك ناتوانێ بەشدار بێت لە ئاوەدانکردنەوە.
- نابێ مرۆڤ کار لەسەر ڕەخنەی ڕووخێنەر بکات، بەڵکو دەبێ ڕەخنەکەی واقعبینانە و بنیادنەرانە بێت.
- نابێ مرۆڤی دەست ڕەنگین و شارەزا و کارامە لە ڕەخنە بترسێ، چونکە ئەوەی کار بکات، هەڵەش دەکات، کەسێك هەڵە ناکات، کە کار نەکات و هەر خەریکی بێکاری و پاڵدانەوە بێت!!!
- مرۆڤ هەرچەند لێهاتوو و شارەزا بێت، نابێ وا بزانێت کە هەموو شتێك دەزانێت.
- ئەگەر مرۆڤ شتێکی نەزانی، پێویستە لە کەسانی شارەزاتر لە خۆی بپرسێت، بۆیە وتراوە دووجار پرسیار بکەیت، باشترە لەوەی یەك جار نەزانیت.
- ئەگەر گوڵ نیت، دڕکیش مەبە!
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٥٥)

## هەژارێکی سەخی

لە یەکێك لە شارەکان، دوکانێکی شیرینی فرۆشی هەبوو، تایبەت بوو بە دەوڵەمەندەکانەوە، واتە، تەنیا دەوڵەمەند و سەرمایەدارەکان دەیانتوانی ئەو جۆرە شیرینییانە بکڕن، چونکە زۆر گرانبەها بوون.

جارێکیان، چەند دەوڵەمەندێك بە مەبەستی کڕینی شیرینی، چووبوونە دوکانی شیرینی فرۆشەکە.

هەژارێکی ڕووت و ڕەجاڵ خۆی کرد بە ژوورەوە و هەموو گیرفانەکانی خۆی گەڕا، جگە لە ١٠٠٠ دینار، هیچی دیکەی شك نەبرد! بۆیە ١٠٠٠ دینارەکەی لەسەر مێزی خاوەن دوکانەکە دانا و گوتی: بایی ئەم ١٠٠٠ دینارە شیرینم بدەرێ!!!

خاوەن دوکانەکە، کە ئەم دیمەنە دڵتەزێنەی بینی، لێی چوو پێشەوە و ڕێزێکی تایبەتی لێ گرت و لە حاڵی پرسی و پێی گوت: قوربان بەخێر بێیت بۆ دوکانەکەم، فەرموو شیرینییەکانمان لەسەر مێز داناون، پارەی خۆت بیخەرە گیرفانتەوە و هەر چەند شیرینیشت دەوێ بۆ خۆتی بەرە!!!!!

چونکە ئەمڕۆ شیرینی بەبێ پارە دەدەینە کڕیارەکانمان!!!!!

دوای ڕۆیشتنی هەژارەکە، دەوڵەمەندەکان، بەو ڕەفتارەی دوکاندارەکە، زۆر سەغڵەت و دڵتەنگ بوون وگلەییان لە خاوەن دوکانەکە کرد و گوتیان:

بۆچی هێنده بەگەرمی پێشوازیت لەو هەژارە کرد، بەڵام بەو گەرم و گوڕییە پێشوازیت لە ئێمە نەکرد؟!!!!!

خاوەن دوکانەکە، گوتی: ئەگەر ئێوەش وەك ئەم هەژارە ڕووت و ڕەجاڵە گشت سەرمایەکەتان لەسەر مێزەکەم دابنێنن، شەرت بێت وەك هەژارەکە ڕەفتار و سەرەدەریتان لەگەڵدا بکەم!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مەردایەتی بە دڵە، بە پارە و پووڵ نییە، بێگومان هەموو هەژارێکی سەخی، دەوڵەمەندە، بەڵام مەرج نییە هەموو دەوڵەندێك سەخی بێت.
- پێویستە هەموومان ڕێزێکی تایبەت لە هەژار و نەدارەکان بگرین، تاکو هەست نەکەن فەرامۆش کراون و پشتگوێ خراون.
- پێویستە دەرفەتەکان بۆ هەژار و دەوڵەمەندەکان یەکسان بن و هەژارەکان نەخرێنە دەرەوەی بازنەوە.
- پێوەری مرۆڤبوون، پارە و پووڵ نییە، بەڵکو هەستبەرزی و مرۆڤدۆستی و ژیاندۆستی و ویژدان زیندوویییە!!!!!
- ........................................
- ........................................
- ........................................

## چیرۆکی
## (٥٦)
## باوەشی خۆشەویستی

ڕۆژێك، ژنێکی لادێ نشین، کە هیچ کاتێ وشەیەکی خۆش لەبارەی خۆشەویستییەوە لە زاری هاوسەرەکەیەوە نەبیستبوو، نەخۆش دەکەوێ!

پیاوەکەی، کە ماتۆڕێکی دەبێ و هەمیشە بە ماتۆڕەکەی هات و چۆی شار دەکات، ناچار دەبێ ژنەکەی لە پشتەوە سواری ماتۆڕەکەی بکات و بیبات بۆ نەخۆشخانە.

بەڵام ژنەکەی، کە یەکەمین جار بوو سواری ماتۆڕ ببێت، لە شەرما ڕەنگی سوورهەڵگەڕا، چونکە نەیدەزانی چۆن چۆنی دەستەکانی بگرێت!

لەناکاو پیاوەکەی پێی گوت: لە باوەشم بگرە!!!

ژنەکەی، بە بیستی ئەو قسەیە، تووشی شۆك بوو!! زۆر نەمابوو لە خۆشییان باڵ بگرێت و بفڕێت!!! لە پشتەوە بە هەردوو دەستەکانی، کەمەری پیاوەکەی گرت!!

لە نیوەی ڕێگە، ژنەکە بە پیاوەکەی گوت: بگەڕێوە ماڵە، پیاوەکەی بە سەر سامییەوە لێی پرسی: بۆچی؟ ئاخر زۆرمان نەماوە بگەینە نەخۆشخانە!!!

ژنەکەی گوتی: حاڵم باشترە، سەر ئێشەکەم نەماوە!!

پیاوەکـە، هاوسـەرەکەی گەیانـدەوە ماڵـەوە، بـەڵام قـەت هەسـتی بـەوە نەکردبوو کە بە دەربڕینی ڕستەیەکی سادەی وەك:( لـە باوەشم بگـرە)، ببێتـە هۆکاری چاکبوونەوەی هاوسەرەکەی و لە نەخۆشی چاك ببێتەوە!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هیچ شتێك وەك قسەی خۆش کاریگەری ئەرێنی لەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤ جێناهێڵێت، بۆیە وتراوە: مار بە قسەی خۆش لە کونێ دێتە دەرێ.
- خۆشەویستی هەوێنی ژیانە، ژیان بەبێ خۆشەویستی، ژانە.
- سەرهەڵدانی زۆربەی نەخۆشییەکانی خێزان، بۆ نەبوونی خۆشەویستی دەگەڕێتەوە لە نێوان ژن و پیاودا، بۆیە ئەگەر خۆشەویستی هەبێت، هەموو نەخۆشییەك قابیلی چارەسەرکردنە و هەموو زامێك قابیلی سارێژکردنەوە و هەموو برینێك قابیلی دەرمان کردنەوە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٥٧)

## گفتوگۆی نێوان منداڵێک و زانایەک

زانایەک بە نەوەکەی گوت: کوڕەکەم گوێ بگرە، باسی ڕاستییەک لە ڕاستییەکانی ژیانت بۆ دەکەم!!!!

کوڕەکە گوتی: فەرموو باپیرە گیان!!

زاناکە: بزانە لە ناخی هەر مرۆڤێک دا، جەنگێک هەیە وەک جەنگی نێوان دوو گورگ، گورگێکیان، نیازی شەڕ و حەسوودی و غیرەکردن و خۆویستی و درۆزنی هەیە!!!!

منداڵەکە: ئەدی ئەویتریان؟

زاناکە: ئەوی دیکە، نیازی خێر و چاکە و ڕاستگۆیی و ئاشتی و خۆشەویستی هەیە!!!!

منداڵەکە بە سەرسوڕمانییەوە لە باپیری پرسی: باشە لە کۆتاییدا کامیان سەردەکەوێ؟

زاناکە پێکەنی وگوتی: هەردەم ئەو گورگە سەردەکەوێت کە تۆ خواردنی دەدەمیتێ!!!

ئەگەر خۆراکی شەڕ و خراپەت دایە، ئەوە خراپە سەردەکەوێ!!! بەڵام ئەگەر خۆراکی خێر و چاکەت دایە، ئەوا باشەکە سەردەکەوێ!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- پێویستە مرۆڤ خۆی لە بوغز و قین بپارێزێ.
- مرۆڤی ژیر و ئازاد و پێگەیشتوو، بەرپرسە لە کارەکانی خۆی، جا باش بێت یان خراپ.
- دەبێ هەستە ئەرێنییەکانی مرۆڤ زاڵ بێت بەسەر هەستە نەرێنییەکانیدا.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

(٥٨)

## بەسەرهاتی خواناسێک و خزمەتکارێک

لە ساڵێکی قاتی و قڕی وگرانی، خواناسێك، خزمەتکارێکی بینی، زۆر دڵی خۆش بوو!

خواناسەکە لێی پرسی: چۆن لەم قات و قڕییە دڵت هێندە خۆشە؟!!!

خزمەتکارەکە گوتی: من خزمەتکاری دەوڵەمەندێکم، هەندێ مەڕ و ماڵاتی هەیە، تا خزمەتی مەڕ و ماڵاتەکەی بکەم، ڕسق و ڕۆزیم دەداتێ!!!

خواناسەکە، کاتێ گوێبیستی ئەو قسەیە بوو، زۆر شەرمی لە خۆی کردەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: خزمەتکارێك دڵی بە دەوڵەمەندێك خۆشە، کە تەنیا هەندێ مەڕ و ماڵاتی هەیە!!!

بەڵام من خوایەکم هەیە، خاوەنی هەموو بوونەوەرە، کەچی لە ڕسق و ڕۆزی خۆم دەترسێم!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

●یەکێك لە سیفەتەکانی پەروەردگار،(الرزاق)ە، واتە، ڕۆزی دەرە، بۆیە ئەوەی خوا لە نەبوونەوە هێنایە بوونەوە، ڕسق و ڕۆزییەکەیشی دەداتێ.

●نابێ مرۆڤ لە ڕەحم و دڵۆڤانی خوا بێ ئومێد بێت.

●قەناعەت سەرچاوەی دڵتێرییە!!

● ..................................................

# چیرۆکی

## (٥٩)

## بەسەرهاتی پیاوێکی زانا و ڕێبوارێک

ڕۆژێك، پیاوێکی زانا، لەسەر کانییەك دانیشتبوو، ڕێبوارێك، کە بەوێدا تێدەپەڕی، لێی پرسی: بە چەند کاتژمێر دەگەمە ئەو گوندە؟

زانایەکە گوتی: جارێ بڕۆ!!!!

ئەو پیاوە وا گومانی برد کە زاناکە گوێی لێ نەبووە، بۆیە پرسیارەکەی دووبارە کردەوە و گوتی: ئایا گوێت لە پرسیارەکەم نەبوو؟

دەڵێم: بە چەند کاتژمێر دەگەمە ئەو گوندە؟

دیسان زانایەکە گوتی: جارێ بڕۆ!!!!

ئەم جارە پیاوەکە هەستی کرد ئەو زانایە شێتە!!!

بۆیە ملی ڕێی گرت و ڕۆیشت!!!!

هێشتا چەند هەنگاوێکی هاوێشتبوو، پیاوە زانایەکە، بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد وگوتی: بە یەك کاتژمێر دەگەیە ئەو گوندە!!!!

پیاوەکە گوتی: بۆچی جاری یەکەم وات نەدەگوت؟!!!

زاناکە گوتی: جاری یەکەم ڕۆیشتنی تۆم نەدیتبوو! بۆیە نەمدەزانی بە چەند کاتژمێر دەگەیتە شوێنی مەبەست، بەڵام ئێستا ڕێ ڕۆیشتنی تۆم بینی، بۆیە دەزانم بە چەند کاتژمێر دەگەیتە شوێنی مەبەست!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- تا مرۆڤ وەڵامی پرسیارێك نەزانێت، نابێ وەڵام بداتەوە.
- دەبێ مرۆڤ پرسیاری ڕێگا لە کەسانی شارەزا بکات، تاکو ون و گومڕا نەبێت.
- نابێ مرۆڤ گومانی خراپ بە خەڵك ببات، چونکە گومانی خراپ سەردەکێشێ بۆ تاوان و ستەم.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (٦٠)

## باوکێکی خەمسارد و کەمتەرخەم

ڕۆژێك بازرگانێك، کە زۆربەی کاتی خۆی بۆ بازرگانی و کۆکردنەوەی پارە و پووڵ تەرخان کردبوو و هیچ گرنگییەکی بە ماڵ و منداڵەکانی نەدەدا، لە ماڵەوە، سەرقاڵی کار و ژێر و ژوورکردنی وەرەقە و کاغەزەکانی بوو و لاپەڕەی یاداشتەکانی هەڵدەدایەوە، کچە بچکۆلانەکەی، خۆی لە مێزی باوکی نزیك کردەوە و لە تەنیشت باوکییەوە دانیشت!!!!

بەلام باوکی، هیچ ئاگای لێ نەبوو! کە کچە بچکۆلانەکەی لە تەنیشتییەوە دانشتووە! تا ئەو کاتەی ناوبراو پێی گوت: بابەگیان ئەوە چی دەکەیت؟

باوکی وەلامی دایەوە و گوتی: هیچ نییە کچم، خەریکم بەرنامەی کارەکانی خۆم ڕێکدەخەم و ناوی ئەو کەسانە لە دەفتەری یاداشتەکانم دەردێنم، کە پێویستە لەم هەفتەیەدا چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا بکەم و لەگەڵیان دانیشم!!!

کچە بچۆلانەکەی، دوای کەمێك بیرکردنەوە، لە باوکی پرسی: بابەگیان ئاخۆ ناوی منیش لەو ناوانەدا هەیە کە لەگەڵیان دادەنیشیت؟!!!! بەم پرسیارە، باوکی ئەو کچەی تووشی شۆك کرد و هەستی کرد، کە باوکێکی

زۆر خەمسارد و کەمتەرخەم بووە لە ئاست ماڵ و منداڵەکانی، بۆیە بڕیاری دا لەمەودوا کاتێکی زیاتر بۆ ماڵ و منداڵەکانی تەرخان بکات!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- پەروەردە و فێرکردن و تێگەیاندن و پێگەیاندن و بەخێوکردنی منداڵ بە شێوەیەکی شایستە، ئەرك و بەرپرسیارەتییە، بە پلەی یەکەمیش لە ئەستۆی دایك و باوك دایە.
- مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە کە هاوسەنگی لە نێوان ئەرکەکان و مافەکان دەپارێزێ و ئەو باڵانس و هاوسەنگییە ڕادەگرێ.
- باوکی دڵسۆز، نابێ لە پێناو پارە و پووڵ و سەرەت و سامان و پلە و پایە، منداڵەکانی خۆی لە سۆز و خۆشەویستی باوکایەتی بێبەش بکات.
- ژیری بە گەورەیی و بچووکی نییە، زۆر جار کەسێکی بچووك، عەقڵێکی گەورەی هەیە و کەسێکی گەورەش، عەقڵێکی بچووکی هەیە.
- هیچ کاتێ پارە ناتوانێ شوێنی سۆز و خۆشەویستی بگرێتەوە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٦١)

## دەرگای خودا

گەنجێك بەم شێوەیە بەسەرهاتی خۆی و کەسێکی نابینا دەگێڕێتەوە: لە لێواری شەقامەکە ڕاوەستابووم، چاوەڕوان بووم قەلەبالغی ئۆتۆمبێلەکان کەمبێتەوە، تاکو بپەڕمەوە، لە تەنیشتمەوە، بینیم پیاوێکی نابینا وەستاوە و دمیەوێت بپەڕێتەوە ئەوبەر.

منیش هەستم بە بەرپرسیارێتی کرد و خێرا چووم دەستم گرت و یارمەتیم دا، تا بپەڕێتەوە!!!

کاتێ گەیشتینە ئەو بەری شەقامەکە، پیاوە نابینایەکە سوپاسی کردم و گوتی: ڕۆڵەگیان ژیانی هاوسەریت پێکەوە ناوە ؟

گوتم: بەلێ (١٢) ساڵە.

گوتی: منداڵت هەیە؟

بە هەناسە ساردییەوە گوتم: نەخێر!!

گوتی: هیچ هەنگاوێکت ناوە بۆ منداڵ بوون؟

گوتم: بەڵێ، هیچ دکتۆرێك نەماوە لە دەرگایی عیادەکەی نەدەم!!

بە زەدەخەنەیەکەوە گوتی: ئەی دەرگایی خوات تاقی نەکردۆتەوە؟

منیش بەسەرسوڕمانییەوە گوتم: نەخێر!!!

دواتـــر ئەو ڕۆیشـــت و منـــیش گەڕامەوە مـــاڵەوە و ئەوەم لەگەڵ هاوسەرەکەم باس کرد!!!

هەستمان بە شەرمەزاری کرد، کە تا ئێستا دەرگایەك کە هەمیشە و لە هەموو شوێنێك کراوەیە تاقیمان نەکردۆتەوە.

بڕیارمانـدا کە لەمەو دوا هەمیشـە لە دەرگـایی ئەو بپـاڕێینەوە، تـا دەرگامان لێ دەکاتەوە!!!

سوێند بە خواساڵێکی نەبرد، خێزانەکەم دوو گیان بوو!!!!!

## پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:

- مرۆڤی بڕوادار دەبێ لە خۆشی و نەخۆشی و شینی و شادیدا خودای لە یاد بێت.
- کلیلی چارەسەری هەموو کێشەکان لای خودایە، بۆیە نابێ مرۆڤ پشت لە خودا بکات، بەڵکو پێویستە هەمیشە لێی بپاڕێتەوە.
- خودا بۆ بەندەکانی لە هەموو کەسێك نزیکترە.
- مەبەست لەم بەسەرهاتە ئەوە نییە کە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانمان سەردانی دکتۆرەکان نەکەین، بەڵکو ئەوەیە، پشت بە خودا ببەستین، چونکە دکتۆر دەرمان دەداتە نەخۆش، بەڵام شیفا لای خودایە!!
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (٦٢)

## بارگرانی

مامۆستایەك، لە دەستپێکی وانەکەیدا، گلاسێکی پڕ لە ئاو کرد و بەرزی کردەوە و لە قوتابییەکانی پرسیاری:(بە ڕای ئێوە کێشی ئەم گلاسە چەندە)؟

قوتابییەکان بە پێی مەزەندەی خۆیان، کێشی گلاسەکەیان دەخستەڕوو!!!

مامۆستاکە گوتی:(منیش بەبێ کێشان، نازانم کێشی چەندە، بەڵام پرسیارەکەم ئەوەیە، ئەگەر بۆ چەند خولەکێك بەم شێوەیە لەناو دەستم ڕایبگرم، چ دەقەومێت)؟

وەڵامدرایەوە (هیچ ناقەومێت مامۆستا)!!!

مامۆستا،(ئەگەر کاتژمێرێك ڕایبگرم چی)؟

یەکێك هاتە وەڵام: (پەیتا پەیتا دەستت ماندوو دەبێت و دواتر سڕ دەبێت).

مامۆستا،ڕاستە، ئەدی ئەگەر تەواوی ڕۆژ بەم شێوەیە ڕایبگرم؟

قوتابییەکی قۆشمە گوتی: (دەستت ڕەق دەبێت، ماسوولکەکانیشت پەکیان دەکەوێت، ڕێشت دەکەوێتە نەخۆشخانە)!

تێکڕای قوتابییان پێکەنین!!!

مامۆستا، دوای بێدەنگی، دیسان بەردەوام بوو:

(زۆر باشە!. ئایا لەم ماوەیەدا، کێشی گلاسەکە کەم دەبێتەوە)؟

قوتابیان لە چەشنی قوتابیانی پۆلی یەکەمی سەرەتایی، پێکەوە گوتیان: (نەخێر).

مامۆستا: (واتە چ شتێك دەبێتە هۆی ئازاری ماسوولکەکانم؟ مـن دەبێت چی بکەم)؟

قوتابیان لە وەڵامدانەوەی دۆشدامان!! لە ئەنجامدا یەکێکیان گوتی:(دەبێ گلاسەکە دانێیتەوە)!

مامۆستا بە خۆشحاڵییەوە گوتی:(ڕاستە! ئاستەنگەکانی ژیانیش هەر بەم شێوەیەن. ئەگـەر گرفتـەکان بـۆ چەنـد خولـەکێك لـە نـاو مێشـك و زەینتـان بهێڵنەوە، کێشـە نابێت. بـەڵام بـۆ مـاوەیـەکی زۆر بیانهێڵنـەوە، ئازاریـان دەبێت. ئەگەر زۆرتر لەمەش بمێننەوە ئەوا پەکتان دەخات و ئیتر ناتوانن هیچ کارێك بکەن).

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ مرۆڤ لە ژیاندا ببێتە مامە خەمە و خەم لە هەموو شتێك بخوات، چونکـە توانـای مـرۆڤ سـنووردارە، نـاتوانێ بەرگـەی هـەموو خـەم و خەفەتێك بگرێت.
- پێویسـتە مـرۆڤ، بیـر لـە چارەسـەرکردنی کێشـەکان بکاتـەوە، نـەك دەستەوەستان، بە دیاریانەوە دانیشێت.
- خەفەت، هیچ دەردێك چارەسەر ناکات و هیچ گرێیـەك ناکاتـەوە و هـیچ برینێك سارێژ ناکات، بەڵکو کێشەکان گەورەتر و ئاڵۆزتر دەکات.
- مرۆڤـی ژیـر، چارەنووسـی خـۆی ڕادەسـتی خـەم و خەفـەت ناکـات و بـە گەشبینی و ئومێدەوە دەڕوانێتە ئاینده.
- ..............................................................
- ..............................................................

## چیرۆکی

## (٦٣)

## ڕابردووی خۆت لە بیر مەکە

دوای نان خواردن، بێڵ گێتس، (٥) دۆلاری لە گیرفانی دەرهێنا و وەك خەڵاتێك، دای بە خزمەتکاری چێشتخانەکە، بەڵام خزمەکارەکە لە جیاتی ئەوەی دڵخۆش بێت، عاجز بوو!!

بێڵ گێتس هەستی بە عاجزبوونی خزمەتکارەکە کرد، بۆیە پێی گوت: چی قەوماوە؟ بۆچی خەمبار بوویت؟

خزمەتکارەکە گوتی: پێم سەیر بوو،(٥) دۆلارم بدەیتێ، کەچی کوڕەکەت لەسەر مێزی تەنیشتت دانیشتبوو، کاتێ ویستی بڕوات، (٥٠) دۆلاری دامێ، لە حاڵێکدا، تۆ دەوڵەمەندترین پیاوی جیهانیت!!!

بێڵ گێتس زەردەخەیەکی کرد و وەڵامێکی پڕ پێستی خۆی دایەوە و گوتی: ڕاستە ئەو کوڕی دەوڵەمەندترین پیاوی جیهانە، بەڵام من کوڕی دارتاشێکی ئاساییم، بۆیە مرۆڤ نابێ هیچ کاتێك ڕابردووی خۆی لە بیر بکات، چونکە ڕابردوو، باشترین مامۆستای مرۆڤە.

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ مرۆڤ بە ماڵی دونیا لەخۆبایی بێت و ڕابردووی خۆی بیربچێتەوە.
- ئەگەر کەسێك خەڵاتێکی پێ داین، هەر چەند کەمیش بێت، دەبێ سوپاسی بکەین و بێ ئەمەك نەبین.
- باشترین شێوازی ژیان ئەوەیە مرۆڤ لە خەرجکردندا ئەوپەڕ و ئەمپەڕ نەکات.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٦٤)

## ئادابی ڕاجیایی

جارێکیان لە کاتی وانە وتنەوە، لەسەر بابەتێك، ناکۆکی دەکەوێتە نێوان پێشەوا شافعی و یەکێك لە قوتابییەکانی، بە ناوی(یونس).

قوتابییەکەی تووڕە دەبێت و مەجلیسی شافعی جێدێڵێت و دەڕواتە ماڵەوە.

بە شەو، پێشەوا شافعی لە دەرگای ماڵی قوتابییەکەی دەدات: کاتێ یونس دەچێ دەرگا بکاتەوە، دەڵێ: کێیە؟

پێشەوا شافعی دەڵێ: (محەمەدی کوڕی ئیدریس)ە.

قوتابییەکەی دەڵێ: بیرم لە ناوی هەموو محەمەدێك کردەوە، تەنیا پێشەوا شافعی نەبێت، واتە قەت قەناعەتم وانەبوو، پێشەوا شافعی بێتە ماڵمانەوە!!!

کە دەرگایەکەم کردەوە، تووشی شۆك بووم، کاتێ پێشەوا شافعیم لە پشت دەرگاکەوە بینی!!!!!

دوای سڵاو و ئەحواڵپرسی، پێشەوا شافعی پێی گوتم: یونس گیان، لەسەر زۆر بابەت کۆك بووین، تەنیا بابەتێك نەبێت! یونس گیان هەوڵ مەدە لە هەموو ناکۆکییەکاندا سەرکەوتوو بیت، هەندێ جار بەدەستهێنانی دڵەکان باشترە لە بەدەستهێنانی هەندێ هەڵوێست!!

یونس گیان، ئەو پردانە مەڕۆخێنە، کە بیناسان کردووە، ڕەنگە لە ئایندەدا پێویستیمان پێی بێتەوە بەسەریاندا تێپەڕین!! با هەمیشە ڕقت لە هەڵە بێت، بەڵام ڕق و کینەت بەرامبەر هەڵەکار نەبێت، لە ناخی دڵەوە ڕقت لە تاوان بێت، بەڵام بەزەییت بە تاوانباردا بێتەوە!!

یونس گیان، ڕەخنە بگرە! بەڵام ڕێز لە ڕەخنەگیراویش بگرە!! چونکە ئەرکمان لەناوبردنی نەخۆشییە، نەك نەخۆش!!!!

ئەم قسانەی شافعی، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر هەست و سۆزی قوتابییەکەی جێهێشت!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ ڕاجیایی ببێتە هۆکارێك بۆ لێکجیابوونەوە و پشت لە یەکترکردن، چونکە هەموو مرۆڤەکان لە ڕەنگ و ڕوخسار و بیرکردنەوەدا لە یەکتری جیاوازن.
- دەبێ پەیوەندییەکانمان لەسەر بناغەی ڕێز و خۆشەویستی بێنە دامەزراندن.
- کێ گەورەترە، دەبێ دڵی فراوانتر بێت، چۆنی پێشەوا شافعی بۆ ماڵی قوتابییەکەی، لەو سۆنگەیەوە بووە زیاتر هەستی بە بەرپرسیارەتی کردووە.

- پێویستە قوتابی ڕێز لە مامۆستای خۆی بگرێت و دان بەخۆیدا بگرێت و کاردانەوەی نەشیاو لەخۆی نیشان نەدات.
- لەسەر هەڵەیەک، نابێ کەسێك بسڕینەوە و هەموو چاکەکانی نادیدە بگرین.
- پیاوی زانا، دەبێ وەك پێشەوا شافعی خاکەڕا(متواضع)بێت و دەرگا بە ڕووی کەسانی دیکەدا دانەخات.
- لە کاتی سەرهەڵدانی کێشەکاندا، کەسانی زانا، زیاتر و زووتر دەستپێشخەری دەکەن و دەستی ئاشتی بۆ کەسانی دیکە درێژ دەکەن.
- پێویستە هەمیشە بەشێك بین لە چارەسەر، بەشێک نەبین لە کێشە.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (٦٥)

## من بەهێزترم یان تۆ؟

باوکێك، ویستی هێزی کوڕەکەی تاقی بکاتەوە، بۆیە ڕۆژێك، دەستی خستە سەر شانی کوڕەکەی و لێی پرسی: کوڕم حەز دەکەم بزانم من بەهێزترم یان تۆ؟

کوڕەکەی گوتی: من!!!

باوکەکە، بە بیستنی ئەو وەڵامە، تووشی شۆك بوو، بۆیە پرسیارەکەی دووبارە کردەوە و گوتی: کوڕم دەمەوێ بزانم من بەهێزترم، یان تۆ؟

دیسان کوڕەکەی، هەمان وەڵامی پێشووتری هەبوو و پێی گوت: من!!!!

باوکەکە هێدی دەستی لەسەر شانی کوڕەکەی هێنایە خوارەوە و چەند هەنگاوێك لێی دوورکەوتەوە، ئینجا ئاوڕی دایەوە و بۆ جاری سێیەم هەمان پرسیاری دووبارەکردەوە و بە کوڕەکەی گوت: پێم بڵێ من بەهێزترم یان تۆ؟

کوڕەکەی گوتی: ئێستا هەست دەکەم تۆ بەهێزتریت!!!!

باوکەکە گوتی: کوڕم بۆچی جاری یەکەم و دووەم گوتت من، بەڵام جاری سێیەم گوتت تۆ؟!!!!!

کوڕەکە گوتی: بابەگیان! جاری یەکەم و دووەم دەستت لەسەر شانم بوو، زۆر هەستم بە بەهێزی دەکرد، چونکە تۆ پشت و پەنام بوویت، بۆیە پێم وابوو زۆر بەهێزم و توانام هەیە ڕووبەڕووی هەموو دونیا ببمەوە، بەڵام کاتێ

دەستت لەسەر شانم هێنایە خوارەوە، هەستم کرد تەنیام و هیچ هێزێکم تیا نەماوە و ئەو هێزەی هەمبوو، لەگەڵ خۆت برد!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- باوک گەورەترین پشت و پەنایە بۆ منداڵ، بۆیە کەس ناتوانێ کەلێنی باوک پڕکاتەوە، بەڵام کاتێ هەستی پێ دەکەیت، کە باوکت لە ژیاندا نەمابێت!!
- باوک بۆ منداڵ وەك قەڵا وایە، هێزی پێ دەبەخشێ و لە گشت شتێکی خراپ و نەگریس دەیپارێزێ...
- باوک سیبەرێکە، منداڵ هەمیشە لە ژێر سایەدا دەحەسێتەوە.
- باوک، هەمیشە بۆ منداڵ پشت و پەنایە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٦٦)

## بەردەکە هەڵدەبژێری یان گەڵایەکە؟

پیاوێکی گەنج، بە مات و غەمگینی لە کەنار ڕووبارێك دانیشتبوو و بە دۆشداماوی سەیری ئاوەکەی دەکرد!!!!

پیاوێکی ساڵمەند بەوێدا تێدەپەڕی! ئەو گەنجەی بینی و هەستی بە ماتی و دڵتەنگی ئەو گەنجەی کرد!

بۆیە خۆی لێ نزیك کردەوە و لە تەنیشت گەنجەکە دانیشت، گەنجەکە هەر زوو گوتی: حاڵم پەریشانە، چونکە ژیانم لێ تاڵ بووە و پێویستیم بە ئارامی هەیە، نازانم لە کوێ ئارامیم دەستم دەکەوێت؟

پیاوە ساڵمەندەکە، گەڵای درەختێکی لێکردەوە و هاوێشتییە ناو ئاوی ڕووبارەکە و گوتی: سەیری ئەم گەڵایە بکە، کاتێ دەچێتە ناو ئاوەکەوە، چۆن چارەنووسی خۆی ڕادەستی ئاوەکە دەکات و لەگەڵ خۆی دەیبات!!!!

ئینجا بەردێکی گەورەشی لە نزیك جۆگەڵەیەکی ئاو دەرهێنا و هێنای و هاوێشتییە ناو ئاوی ڕووبارەکەوە!!!!

بەرد، چونکە قورس و سەنگین بوو، بۆیە نقووم بوو و ژێر ئاو کەوت و لە ژێر ئاوەکە لە تەنیشت بەردەکانی دیکە وەستا!!!

ئینجا پیاوە ساڵمەندەکە بە گەنجەکەی گوت: گەڵایەکەت بینی، بەهۆی سووکبوونەکەیەوە، شەپۆڵەکانی ئاوەکە، ئەملا و ئەولای پێ دەکرد و لەگەڵ خۆی دەبرد!!!

بەڵام بەردەکە، چونکە قورس بوو، بۆیە توانی بەسەر ئاوەکەدا زاڵبێ و بچێتە ژێر ئاوەوە..

ئینجا پیاوە ساڵمەندەکە بە گەنجەکەی گوت: ئێستا پێم بڵێ بەردەکە هەڵدەبژێری، یان گەڵایەکە؟

دەتەوێ شەپۆلەکانی نەخۆشییەکانی ژیان ئەملا و ئەولات پێ بکەن، یان وەك بەرد سەنگین و قورس بیت و شەپۆلەکانی ژیان نەتوانن زەفەرت پێ ببەن و لە شوێنی خۆت جێگر و چەسپاو بیت!!!!!!!

گەنجەکە، پەندێکی چاکی لەم بەسەرهاتە وەرگرت و بڕیاری دا وەك بەرد سەنگین بێت!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- پێویستە مرۆڤ لە ژیاندا خۆڕاگر بێت و چارەنووسی خۆی نەداتە دەست شەپۆلە مەترسیدارەکانی ژیان.
- پیاوە ساڵمەند و بەتەمەنەکان، کەسانی گەڕیدە و دونیا دیدە و خاوەن ئەزموونن، بۆیە پێویست گەنجەکان سوودی لێوەربگرن.
- نابێ مرۆڤ ڤایرۆسی خەفت هەڵگرێ، بەڵکو دەبێ بەسەر ئەو نەخۆشییە کوشندەیەدا زاڵ بێت و بە ژیان پێبکەنێت، نەك ژیان پێی پێ بکەنێت!!!!!!!

## چیرۆکی

## (٦٧)

## بەسەرهاتی شێتێک و مەلەوانێک

مەلەوانێك، لە کەنار ڕووبارێك وەستا بوو!!

لە ناکاو گوێبیستی دەنگێك بوو، هاواری دەکرد فریام کەوە فریام کەوە!!

مەلەوانەکە ئاوڕی دایەوە، سەیری کرد پیاوێك خەریکە لە ناو ڕووبارەکە نغرۆ دەبێت و زۆری نەماوە بخنکێت!!!

خێرا خۆی گەیندە ڕووبارەکە و ئەو کەسەی لە مردن ڕزگار کرد!!!

بەڵام لە لایەکی دیکەوە گوێبیستی دەنگی دوو کەسی دیکە بوو، هاواریان دەکرد: فریامان کەوە فریامان کەوە خەریکە دەخنکێین!!!

مەلەوانەکە بە پەلە ئەو دوو کەسەشی لە مردن ڕزگار کرد!!

بەڵام پێش ئەوەی لە ئاوەکە بێتە دەرەوە، گوێبیستی چوار کەسی دیکە بوو، هاواریان دەکرد! فریامان کەوە... فریامان کەوە!!!!!

کاری ئەو مەلەوانە هەر لە بەیانی تا ئێوارێ، ڕزگارکردنی خەڵك بوو لە خنکان!!!

بەڵام مەلەوانەکە غافل بوو لەوەی کە شێتێك لە سەرەوە هەیە، یەکە بە یەکەی خەڵکەکە فڕێ دەداتە ناو ئاوەکەوە!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- دۆزینەوەی هۆکاری نەخۆشییەکە، لە چارەسەرەکەی گرنگترە، چونکە ئەگەر هۆکارەکەی نەدۆزرێتەوە، نەخۆشییەکە تەشەنە دەکات و بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبێتەوە و کۆنترۆڵ ناکرێت.
- ڕزگارکردنی خەڵك لە تەنگانە، هەم ئەرکە، هەمیش فەزیلەتە!!
- نابێ مرۆڤە ژیر و عاقڵەکان لە ئاست کەسە دەبەنگ و کاڵفامەکان بێدەنگ بن، چونکە ژیان دەکەن بە ژان!!!!
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٦٨)

## ڕاوکردنی شێر

کەسێکی گوندنشین بە ناوی ڕەشید، بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ماڵەوە، ڕۆیشتبوو ناو دارستان، بەڵام نەیتوانی بە ڕۆژ بگەڕێتەوە لادێ و شەو بەسەرداهات و تاریکی باڵی بەسەر دارستانەکەدا کێشا، گوندنیشنەکە، پەیتا پەیتا بەرەو ماڵەوە کەوتە ڕێ، بەڵام گوێبیستی جووڵەی حەیوانێکی دڕندە بوو، خەریك بوو بەرەو ڕووی دەهات!!!

زۆر ترسا! چونکە جگە لە بڤرێك، هیچ چەکێکی دیکەی پێ نەبوو، کە بەرگری لە خۆی بکات! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ناچار بوو، خۆی بۆ شەڕی ئەو حەیوانە ئامادە بکات، چونکە جگە لە شەڕی مان و نەمان، هیچ ڕێگەیەکی دیکەی لە پێش نەبوو!!!!

حەیوانە دڕندەکە لێی نزیك بووە، بەڵام پێش ئەوەی پەلاماری بدات، ڕەشید لێی هاتە دەست و بە بڤر هێرشی کردە سەر حەیوانەکە و دوای شەڕێکی دەستەو یەخە، دواجار بەسەریدا سەرکەوتوو و توانی بیکوژێت!!!

ڕەشید، لە دڵی خۆیدا گوتی: مادام حەیوانەکەم کوشت، باشتر وایە کەوڵیشی بکەم و کەوڵەکەشی لە بازاڕ بیفرۆشم و سوودی لێ وەربگرم!!!!

حەیوانەکەی کەوڵ کرد و کەوڵەکەی لەسەر شانی دانا و بۆ بەرەبەیان گەیشتەوە گوندەکەیان.

هەندێ خەڵکی ئاوایی، هاتنە پێشوازی ڕەشید، کاتێ بینییان شێرێکی ڕاوکردووە وکەوڵەکەیشی هێناوەتەوە!!! لە ئازایەتی ئەو پیاوە سەریان سوڕما و پێکەوە هاواریان کرد: ئەی خەڵکینە! ئەی خەڵکینە ڕەشید شێرێکی ڕاوکردووە!!!

کە ڕەشید ئەمەی بیست و سەیری کەوڵەکەی کرد! لە ترسا زندەقی چوو و کەوڵەکەی فڕێدا و لە هۆش خۆی چوو و بووڕایەوە!!!!!

چونکە تا ئەو کاتە نەیزانیبوو شێرە!! وای زانیبوو کە حەیوانێکی دیکەیە!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ خاوەن هێز و توانایەکی زۆرە، بەڵام زۆرجار باوەڕبەخۆنەبوون، وا لە مرۆڤ دەکات، کە نەتوانێ ئامانجەکانی خۆی بپێکێت!!
- نابێ مرۆڤ لە مەیدانی ڕووبەڕووبوونەوەدا، چارەنووسی خۆی ڕادەستی نەیارەکانی بکات، بەڵکو دەبێ ڕێگەی بەرگری و بەرخودان هەڵبژێرێت، چونکە مرۆڤ بە پێوە بمرێت، باشتر و خۆشترە لەوەی لەسەر ئەژنۆ بژیێت!!!!
- ئەگەر پیاو پیاو بێت، با چەکەکەی بڤر بێت، دەتوانێ زەفەر بە دوژمن ببات...
- مرۆڤ نابێ لە ژیاندا ترسنۆك بێت، چونکە کەس بە ترسنۆکی ناتوانێ تەمەنی خۆی زیاد بکات!!!!!!

## چیرۆكی

## (٦٩)

## چڵ ساڵ بەبێ تاوان لە زیندان دا مایەوە!!!

گەوامی ئەگامۆ، هاوڵاتییەکی ڕەشتپێستی بێ تاوانی ئەمریکییە، لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو، بە تۆمەتی کوشتنی کەسێك، هاتە گرتن و کەسێك بە نارەوا، لە دادگا، لەبەردەم حاکم گەواهیی دا کە بینیویەتی کەسێکی کوشتووە!!!!
دوای دادگایکردن، حاکم بڕیاریدا بۆ هەتا هەتایە زیندانی بکرێت.
بۆیە گەوامی ئەگامۆ، هەر لە تەمەنی ١٧ ساڵییەوە خرایە زیندانەوە و بۆ ماوەی چڵ ساڵ بەبێ تاوان لە زینداندا مایەوە، لە تەمەنی ٥٧ ساڵی، دادگا ئەستۆپاکی گەوامی ئەگامۆی سەلماند و بڕیاری ئازادکردنی دەرکرد، چونکە ئەو بکوژەکە نەبوو، بەڵکو کەسێکی دیکە، بکوژی هەقیقی بوو!!!!
بۆیە کاتێ دادگا ئەستۆپاکی (گەوامی ئەگامۆ)ی ڕاگەیاند، ئەو پیاوە بە کوڵ گریا و ئەو بڕە پارەیەی کە دادگا، بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو دابینابوو، کە بریتی بوو لە یەك ملیۆن دۆلار، ڕەتی کردەوە و وەری نەگرت، ئەو تەنیا یەك داوای لە دەوڵەتی ئەمریکا هەبوو!!! داوایەکەیشی ئەوە بوو کە ئەمریکا بە یاساکانیدا بچێتەوە، بۆ ئەوەی کەسێکی دیکەی بێ تاوانی وەك ئەو، نەکەوێتە زیندانەوە و نەبێتە قوربانی ستەم و نادادپەروەری!!!!!!!!!!!!!!!!!!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نەک هەر ئەمریکییەکان، تەنانەت هەموو جیهانیش، ناتوانێ ئەو چڵ ساڵە بۆ ئەو پیاوە قەرەبوو بکاتەوە.
- نابێ مرۆڤ بەبێ بەڵگە کەس سزا بدات، چونکە دەچێتە خانەی ستەم و تاوانەوە.
- هیچ کاتێ تەمەن بە پارە و پووڵ و سەروەت و سامان ناکڕدرێتەوە.
- نابێ مرۆڤ هێندە ویژدان مردوو بێت، بە ئەنقەست گەواهی لەسەر کەسێك بدات.
- هەڵەی وا هەیە، هەرگیز قەرەبوو ناکرێتەوە، بۆیە دەبێ خۆمان لەو جۆرە هەڵانە بپارێزین.
- مرۆڤ هەر چەند لە دونیا پێشکەوتوو بێت، ناتوانێ لە ١٠٠% دادپەروەری بەرقەرار بکات.
- ........................................................
- ........................................................
- ........................................................

## چیرۆکی

## (٧٠)

## هونەری کتێب خوێندنەوە

گەنجێکی ئەفغانی، کە خوێندکارێکی زانکۆ بوو، لە یەکێك لە زانکۆکانی سویسرا، بەم شێوەیە بەسەرهاتی خۆی و مامۆستایەکەی دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك لەگەڵ یەکێك لە مامۆستاکانم چوومە کافتریا، بۆ ئەوەی پێکەوە قاوەیەك بخوینەوە، لەوێ باسمان لە ڕەوشی خراپی ئەفغانستان کرد، مامۆستاکەم، قسەیەکی سەرنجڕاکێشی گوت، کە زۆر سەرنجی ڕاکێشام!!!

ناوبراو گوتی: پێت وانەبێت قورعەکێشی بۆ وڵاتانی دونیا کراوە، بۆیە هاوڵاتیانی وڵاتێکی وەك سویسرا شانسێکی چاکیان هەیە!! هاوڵاتیانی وڵاتێکی وەك ئەفغانستانیش، شانسێکی خراپیان هەیە!!!!

بەڵکو هەر میللەتێك، حکومەتێك بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت، کە شایستەی خۆی بێت.

بۆیە مافی سویسرییەکانە ئەم جۆرە حکومەتەیان هەبێت، ئەفغانییەکانیش تەنیا شایستەی ئەو جۆرە حکومەتەن، کە ئێستا فەرمانڕەوایەتییان دەکات!!!

برادەرێکی دیکەی ئەفغانیم لەگەڵ بوو، لە ڕوخساری دیار بوو، هەستی بە شەرمەزاری کرد!!!!

مامۆستاکەم، فنجانی قاوەکەی لە لێوەکانی کردەوە و بزەیەکی کرد و گوتی: هەر هاوڵاتییەکی سویسری، ساڵانە ١٠ کتێب دەخوێنێتەوە، بۆیە ئەگەر گەڕایەوە ئەفغانسان، بە ناوی منەوە بە هەر ئەفغانییەك بڵێ: مامۆستاکەم گوتی: ئەگەر هەر ئەفغانییەك لە ساڵێکدا تەنیا کتێبێك بخوێنێتەوە، ئەوا دەتوانێ ڕۆڵی لە پێشڤەبردنی وڵاتەکەیدا هەبێت و شوێن پەنجەی دیار بێت...!!!!!!

ئینجا زانم نهێنی پێشکەوتنی گەلی سویسرا، گرنگیدانیانە بە کتێب و زانست و مەعریفە!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- میللەتانی زانا و نەزان و تێگەیشتوو و تێنەگەیشتوو و سەرکەوتوو و شکستخواردوو و پێشکەوتوو پاشکەوتوو بە زانست و مەعریفە لێکجیادەکرێنەوە.
- کتێب چەقی گشت گۆڕانکارییەکانە، چونکە سەرچاوەی سەرەکی مەعریفەیە.
- خۆفێرکردن نەنگ و شوورەیی نییە، بەڵام نەزانین نەنگ و شوورەییە.
- هیچ کەسێك لە پڕێك نابێ بە کوڕێك، وڵاتانی پێشکەوتوو، بە هەوڵ و هیممەت و کۆشش و شەونخۆنی خۆیان ئەمڕۆیان دروست کردووە!!!
- ...............................................
- ...............................................

## چیرۆکی

## (٧١)

## تۆڵەی ستەمکردن

کەسێك ئاوا بەسەرهاتی خۆی و چێشکەیەك(چیچکێك) دەگێڕێتەوە:
جارێکیان، چێشکەیەکم گرت، یەکێك لە قاچەکانی ئەو چێشکەیەم بە سەری دەزوویەك بەستەوە، سەرەکەی دیکەی ئەو دەزووەم بەدەستەوە گرت، ئینجا چێشکەکەم بەڕەڵا کرد، چێشکەکە زۆر جار هەوڵی دا بفڕێت، بەڵام من لەلای خۆمەوە ڕام دەکێشایەوە و دووبارە دەکەوتەوە سەر زەوی!!!

ئەم دیمەنە، دایکمی زۆر ئازار دا و پێی گوتم: ڕۆڵەگیان واز لەو بەستەزمانە بهێنە، بۆچی ستەمی لێ دەکەیت، وەڵڵا خوا تۆڵەی ئەو چێشکەیەت لێ دەکاتەوە!!

بەڵام هەر گوێم نەدایە قسەی دایکم و بەردەوام بووم لەسەر ئازاردانی ئەو چێشکە بەستەزمانە!!!!!

جارێکی دیکە چێشکەکە ویستی بفڕێتەوە و لەدەستم ڕزگاری بێت، بەڵام ئەم جارەیان زۆر بە تەندی دەزووەکەم ڕاکێشا و قاچێکی چێشکەکە بە ڕانەوە دەرهات!!!

تەنیا دوو ڕۆژ دوای ئەو ڕووداوە، بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشتم، لەناکاو کەوتمە ناو چاڵێکی قووڵەوە، قاچێکم لە ناو دوو بەردی گەورە گیری

خوارد، چەندی کردم نەمتوانی بێمە دەرەوە، لە ئەنجامدا ڕانێکم لە(کماخ)ەوە دەرهات!!!

ئینجا قسەی دایکم بەبیر هاتەوە و زانم زوو یان درەنگ، خوا هەر تۆڵە لە ستەمکار دەکاتەوە!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ چی بچێنێت، ئەوە دەدورێتەوە.
- گوێڕایەلی نەکردنی دایك، مرۆڤ بەرەو نەگبەتی و مەینەتی و کارەسات دەبات.
- مرۆڤ بەهۆی ستەمەوە، هەم خودا، هەمیش خەڵك لە خۆی تووڕە دەکات.
- مرۆڤی ژیر، ستەم لە کەس ناکات، تەنانەت لە چێشکەیەکیش، چونکە کەس بێ ساحێب نییە و خوا ساحێبی هەموو بوونەوەرە و هەموو شتێك دەزانێ و هەموو کەسێك دەبینێ و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.
- ................................................
- ................................................
- ................................................

## چیرۆکی

(٧٢)

## دۆنکی

قوتابییەك، لە وانەی ئینگلیزی زۆر تەمبەڵ بوو، چونکە هەمیشە نمرەیەکی کەمی دەهێنا، مامۆستای بابەتی ئینگلیزی، کاتێ دەفتەرەکەی واژوو دەکرد، لەسەری دەنووسی(دۆنکی)، واتە (کەر)!!!!

جارێکیان، مامۆستایەکە واژووی لەسەر دەفتەری قوتابییە تەمبەڵەکە کرد، بەڵام لەبیری چوو بنووسێت دۆنکی!!!

بۆیە قوتابییەکە گازی مامۆستایەکەی کرد وگوتی: مامۆستا...مامۆستا لە بیرت چوو ناوی خۆت بنووسیت!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- بۆ مامۆستا، یان دایك و باوك، یان هەر کەسێکی دیکە نییە بێ ڕێزی بە هیچ مرۆڤێك بکات و کەسایەتییەکەی تێکبشکێنێت، چونکە مرۆڤ ڕێز و شکۆی خۆی هەیە.
- هیچ کاتێك هەڵە بە هەڵە چارەسەر ناکرێت،.
- ئەگەر مرۆڤ درکی پێشکەش بە کەسێك کرد، نابێ چاوەڕوانی ئەوە بکات ئەو کەسە گوڵی پێشکەش بکات.
- مامۆستا کەسێکی فێرکار و پەروەردەکارە، بۆیە دەبێ بە شێوەیەکی زانستییانە و بابەتییانە و پەروەردەکارانە سەرەدەری لەگەڵ قوتابییەکانی بکات.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٧٣)

## بەسەرهاتی زانایەک و دەوڵەمەندێک

کەسێکی دەوڵەمەند، پارە و پووڵێکی زۆری هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، حەزی لە زانست و فێربوون بوو، بۆیە چوو بۆ لای کەسێکی زانا، کە لە ژووری خۆیدا دانیشتبوو و داوای لێکرد،فێری وانەیەکی بکات، کە لە ژیانی خۆیدا سوودی لێوەربگرێت!!!

زاناکە هەستا سەرپێ و دەستی دەوڵەمەندەکەی گرت و بردییە پێش پەنجەرەی ژوورەکەی و پێی گوت: سەیری ئەم پەنجەرەیە بکە!! دەوڵەمەندەکە سەیری پەنجەرەکەی کرد.

ئینجا زاناکە پێی گوت: چیت لە پەنجەرەکەوە دیت؟

دەوڵەمەندەکە گوتی: ئاسمان و زەوی و بەرد و دار و خەڵکم بینی!!!

ئینجا زاناکە دووبارە دەستی دەوڵەمەندەکەی گرتەوە و ئەم جارە بردی بۆ بەردەم ئاوێنەیەك و پێی گوت: سەیری ئاوێنەکەش بکە، دەوڵەمەندەکە سەیری ئاوێنەکەشی کرد، ئینجا زانایەکە لێی پرسی: چیت لە ئاوێنەکەدا دیت؟

دەوڵەمەندەکە گوتی: تەنیا خۆمم تێدا بینییەوە!!

زاناکە ڕووی لە دەوڵەمەندەکە کرد و گوتی: جەنابتان هەردوو شووشەکەت تاقیکردەوە، جیاوازی نێوان شووشەی یەکەم و دووەم تەنیا بۆیاغێك بوو!

شووشەی یەکەم، چونکە ڕۆشن و زەلاڵ بوو، وایکرد، کە دار و بەرد و ئاسمان و زەوی و خەڵك ببینی!

بەڵام شووشەی دووەم، چونکە بۆیاغی لێدرابوو، بۆیە وای لە تۆ کرد، کە تەنیا خۆت ببینی و هیچی تر نا!

ڕۆڵەی شیرینم: بزانە دڵی پاك وەك شووشەی پەنجەرە وایە، دەتوانێ هەموو کەسێك ببینێت، بەڵام دڵی ژەنگ گرتوو، وەك شیشەی ئاوێنە وایە، تەنیا خۆی دەبینێت و کەسی دیکە نابینێت.

بۆیە هەوڵدە دڵت پاك بێت و هەموو خەڵك ببینێ!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤی خۆپەرست و خۆویست، تەنیا خۆی دەبینێ و ئەوانی دیکە نابینێ، بەڵام مرۆڤی مرۆڤدۆست و ژیاندۆست، دڵێکی فراوانی هەیە، هەموو خەڵك دەبینێ.
- مرۆڤی دووربین ئاسۆیەکی گەشی لە پێشە، بەڵام مرۆڤی کورت بین، ئایندەیەکی ڕەشی لە پێشە.
- مرۆڤ هەر چەند دەوڵەمەندیش بێت، پێویستی بە زانست و زانیارییە، بۆیە نابێ زانست و مەعریفە بکاتە قوربانیی سەروەت و سامان.
- ئەگەر مرۆڤ شتێکی نەزانی، دەبێ ب پرسێ، چونکە پرسیار نیوەی وەڵامە و کلیلی کردنەوەی نهێنی و شتە نەزانراوەکانە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی

## (٧٤)

## دۆلارێک بە ١٥٠٠ دۆلارە

مامۆستا شەماڵ موفتی، خوا لێی خۆش بێت، ئاوا ئەم بەسەرهاتەی خۆی دەگێڕێتەوە: ساڵی ١٩٩١ لە ڕێکخراوێکی بیانی فەرمانبەربووم، ڕۆژێک هاتمەوە، خێزانم گوتی: شەماڵ میوانمان هەیە وگۆشتیشمان نییە...

منیش چووم بۆ دارۆغا، قەسابخانەیەکی لێبوو، بەردەوام لەوێ گۆشتم دەکڕی، داوامکرد دوو کیلۆ گۆشتم بۆ بکێشێت!!!

سەیری دەستی قەسابەکەم دەکرد، لەوکاتەدا، کەسێک لە دوامەوە گوتی: کاکە دوگ هەیە؟

کابرای قەساب گوتی: نا..نیمانە.

منیش گوتم: دوگی بۆ چییە؟!

قەسابەکە گوتی: هەژارە، دوگەکە دەتوێنێتەوە و بە ڕۆنەکەی، چێشت لێدەنێت و تامی گۆشتیشی بۆ دەدات!!!!

ئاوڕێکم دایەوە، سەیری پیاوە هەژارەکەم کرد، پیاوێکی ڕیش سپی بوو.

بە کابرای قەسابم گوت : ئەگەر کیلۆیەک گۆشتی بۆ بکڕم، تۆ بڵێی لێم وەربگرێت؟

قەسابەکە گوتی: بۆ نا!! هەژارە و موحتاجە!!!

گوتم: کیلۆیەکیش بۆ ئەو بکێشە..

گوتی: چوومە دەرەوە و پەلەم بوو، پیاوە هەژارەکە کەمێک لەولاوە وەستا بوو!!!

گوتی: جیام کردەوە و گوتم کاک حاجی، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: (کەسێک دیارییەکت پێشکەش بکات، ڕەتی مەکەرەوە)، منیش ئەم کیلۆ گۆشتەم بە دیاری بۆت هێناوە.

کابرای هەژار، کیلۆ گۆشتەکەی لێ وەرگرتم و دوعای بۆ کردم و فرمێسکی بەسەر ڕیشە سپییەکەیدا دەهاتە خوارەوە!!!

منیش پەلەم بوو، سەیری کاتژمێرەکەم کرد، بەپەلە ڕۆشتمەوەماڵەوە

کەگەیشتمە ماڵەوە، خێزانم گوتی: ئێستا ڕێکخراوەکەوە تەلەفۆنیان کرد، تۆیان دەویست.

منیش شتەکانم داگرت و ڕۆیشتم بۆ ڕێکخراوەکە.

بەڕێوەبەری ڕێکخراوەکە، کە کەسێکی بیانی بوو، گوتی: مستەر شەماڵ ئەو فاکسەی سەر ئامێری فاکسەکە بۆ تۆ هاتووە.

کە چووم سەیرم کرد، سەرم سوڕما!!!

بیانییەکە گوتی: مستەر شەماڵ چییە؟ بەلاتەوە کەمە؟

گوتم: نەوەڵا کەم نییە، بەڵام خوای گەورە دەفەرموێت: چاکە بکەن یەک بە دە، پاداشتتان دەدەمەوە، لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: یەک بە سەد، لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: یەک بە حەوت سەدە!!!

بەڵام بە خوا ئەمە یەک بە (١٥٠٠)ە، چونکە کیلۆیەک گۆشت بە یەک دۆلار بوو، من یەک دۆلارم بەخشی، خوای گەورە لەوکات و

ساتەدا، ڕێک لەوکاتەدا، کە کیلۆ گۆشتەکەم داوەتە هەژارەکە، بڕی ١٥٠٠ دۆلار لە بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخراوەکەوە وەکو پاداشت بۆ منیان نارد....

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- خێرە و سەدەقە و بەخشین، هۆکارێکە بۆ ئەوەی بەرەکەت بکەوێتە ماڵ و سامان و تەمەنی مرۆڤەوە.
- خێرە و سەدەقە و بەخشین، هەم دڵ و دەروونی بەخشەرەکە ئاسوودە دەکات، هەمیش خۆشی و شادی دەخاتە دڵی هەژارەکەوە.
- کاتێ مرۆڤ کەسێك دەبینێ لە تەنگانەدایە، نابێ دەستەوەستان بوەستێ، بەڵکو دەبێ دەستباری بێت و لەو تەنگانەیە ڕزگاری بکات.
- چاکە بە چاکەیە، بۆیە دەڵێن: مرۆڤ چی بچێنێت، ئەوە دەدورێتەوە....
- ....................................................
- ....................................................
- ....................................................

## چیرۆکی

## (٧٥)

## بەسەرهاتی سەرتاشێکی خۆبەخش و منداڵێکی هەژار

سەرتاشێك، بڕیار دەدات لە یەكێك لە گەڕەكە هەژار نشینەكان، ڕۆژێك تەرخان بكات، بۆ تاشینی سەری هەژار و نەدارەكان!!!!

منداڵێكی هەژار و بێ باوك، دێتە لای سەرتاشەكە و دەڵێ:

كاك عەلی: بێ بەرامبەر سەر دەتاشی!!!

عەلی گوتی: بەلێ!!

منداڵەكە، هەر زوو بە پەڵە گەڕایەوە ماڵەوە!!!

عەلی بانگی كرد: وەرە وەرە بۆچی وا خێرا ڕۆیشتیت؟!!!!

منداڵەكە گوتی: دایكم ٢٠٠٠ دیناری دابوومێ، بۆ ئەوەی سەرم بتاشم! ئێستا دەچم ئەو ٢٠٠٠ دینارە دەدەمەوە دایكم، بۆ ئەوەی خواردنی زیاتری بۆ ئێمە پێ بكرێت!!!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- کەسێك قەدری پارە دەزانێت، کە نەیبێت!!!
- نابێ مرۆڤ هیچ کاتێ خۆی لە کاری خێر و چاکە بێبەش بکات، نەخاسمە لەگەڵ منداڵانی باوك مردوو و دایك مردوو و هەژار و نەدار و لێقەوماو و نەخۆش.
- گوێڕایەڵی منداڵ بۆ دایك و باوك، هەم ئەرکە هەمیش بەرپرسیارەتی.
- دەبێ مرۆڤ هەمیشە لە ژیاندا دەستپاك بێت و لەگەڵ کەسانی دیکە ڕاستگۆ بێت.
- هیچ کارێکی خێر بە کەم مەزانە، چونکە ئەگەر لە تەرازووی خەڵکیشدا سووك بێت، ڕەنگە لە تەرازووی خودای دڵۆڤاندا زێدە قورس و سەنگین بێت.
- ...............................................
- ...............................................
- ...............................................

# چیرۆکی
## (٧٦)
## هەر کارێک، کاردانەوەیەکی هەیە

شـۆفێری بارهـەڵگرێك، بـە مەبەسـتی نـان خـواردن، لـە یـەکێك لـە چێشـتخانەکان لایـدا، هێشـتان دانەبـەزی بـوو، سـێ گـەنجیش، کـە هـەر یەکێکیان ماتۆڕێکی پێ بوو، بۆ نان خواردن لە هەمان چێشتخانە دابەزین!!

ئەو سێ گەنجە لەسەر مێزی شۆفێرەکە دانیشتن و ویستیان تەشقەلەی پێ بکەن.

دوای چەنـد خولـەکێك، شـۆفێرەکە جگەرەیـەکی دەرهێنـا و دایگیرسـاند! بەڵام ئەو سێ گەنجە جگەرەی شۆفێرەکەیان کوژاندەوە!!!

شۆفێرەکە هیچی نەگوت!!!

جاری دووەم، یەکێك لە گەنجەکان، پیپسییەکی بە شۆفێرەکەدا کرد، ئەم جارەش شۆفێرەکە خۆی لە گێلی دا...

جاری سێیەم، کاتێ شۆفێرەکە ویستی حیسابەکەی بدات و بڕوات، یەکێك لەو سێ گەنجانە، قاچی خستە بەر قاچەکانی و کەوتە سەر زەوی!!!

بەڵام شۆفێرەکە هەستایەوە و هیچ کاردانەوەیەکی لەخۆی نیشان نەدا!!!!

دوای چەنـد خولـەکێك، لـە دەرچـوونی شـۆفێری بارهەڵگرەکـە لـە چێشتخانەکە، ئەو سێ گەنجەش، پارەی خۆیان دا و ویستییان بڕۆن!!!

کە هاتنە دەرەوە، تووشی شۆك بوون! چونکە بینییان هەر سێ ماتۆڕەکانیان تێکشکاون و بارهەڵگرەکە خۆی پێداکێشاوە و شۆفێرەکە بە تێکشکاندنی ئەو سێ ماتۆڕە، تۆڵەی خۆی لەو سێ گەنجەی کردەوە!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ چی بچێنێت، ئەوە دەچنێتەوە، کەسێك دڕك بچێنێت، نابێ بە هیوای چنینەوەی گوڵ بێت!!!
- قەشمەریکردن بە خەڵك، کاری مرۆڤی ژیر و عاقڵ نییە.
- نابێ گەنجەکان بەگەنجێتی خۆیان، لەخۆبایی ببن و کاری تێکدەرانە ئەنجام بدەن.
- هەر کارێك، کاردانەوەیەکی هەیە، تەنانەت پشیلەش ئەگەر تەنگاو بوو، پەلاماری شێر دەدات!!!
- هەڵە بە هەڵە ڕاست ناکرێتەوە، بەڵام سەبر و ئارامیش سنووری خۆی هەیە.
- هەبوونی تەبایی و تفاق بۆ ئەنجامدانی چاکە، کارێکی زۆر پێویستە، بەڵام ئەگەر بۆ ستەم و زۆرداری بێت، کارێکی نەگریس و چەپەڵە و هۆکارێکە بۆ تێکدانی ئاشتی کۆمەڵایەتی.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٧٧)

## پیاوێکی نابینا و ژیر

کچێك شووی بە پیاوێکی نابینا کرد، ڕۆژێك پێی گوت: پیاوەکە، ئەگەر منت بدیبایە کە چەندە جوان و کەشخە و سپیم! زۆر پێم سەرسام دەبوویت..!!!

پیاوەکەیشی، کە کەسێکی ژیر بوو، ژیرانە وەڵامێکی پڕ پێستی دایەوە و گوتی: ژنەکە، ئەگەر وا بوایە، ئەوا چاوساغەکان تۆیان بۆ من جێنەدەهێشت!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- پەتی درۆ کورتە!
- مرۆڤ نابێ هێندە سادە و ساویلکە بێت، بە ئاسانی هەڵبخەڵەتێت.
- مرۆڤی ژیر دەبێ لە مەبەستی بەرامبەر تێبگات، ئینجا وەڵامی بداتەوە.
- پێویستە مرۆڤ هەمیشە ئاگاداری مەکر و حیلەی ئافرەتانی فێلباز بێت.
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٧٨)

## بەسەرهاتی پێشەوا غەزالی و دزەکان

ڕۆژێك، دز و جەردەکان، ڕێیان لە پێشەوا غەزالی گرت و گوتیان: هەرچیت هەیە لە پارە و پووڵ و سەروەت و سامان، هەمووی دەربێنە!!!

پێشەوا غەزالیش کە زانی ئەوان دزن و هیچیان لەگەڵ ناکرێت، گوتی باشە هەرچیم هەیە لە پارە و پووڵ و سەروەت و سامان بۆ خۆتان بێت، بەڵام تەنیا یەك تکام هەیە، کتێبەکانم مەبەن، چونکە من قوتابی عیلمم، پێویستیم بە کتێبەکان هەیە!!!

یەکێك لە دزەکان گوتی: بەڕاستی تۆ قوتابییەکی خراپی!!!

پێشەوا غەزالی گوتی: بۆچی؟

دزەکە گوتی: دەبوایە گشت کتیبەکانت ئەزبەر بوایە، بۆ ئەوەی لە کاتی دزینیان تووشی کێشە نەبویتایە!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هەمیشە زانست، لە پارە و پووڵ و سەروەت و سامان باشترە، چونکە زانا دەتوانێ پارە پەیدا بکات، بەڵام پارە ناتوانێ زانست پەیدا بکات.
- زانست پلە و پایە و شەرەف و بەرزی بە مرۆڤ دەبەخشێ، بەڵام پارە نا.
- ئەگەر لە نێوان زانست و پارەدا مرۆڤ سەرپشك کرا، دەبێ مرۆڤ زانستەکە هەڵبژێرێ، نەك پارەکە.
- مرۆڤ بەهۆی زانستەوە بەرز دەبێتەوە نەك بەهۆی پارەوە، بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییەش، با سەیری مێژوو بکەین، زاناکان ناویان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا تۆمار کراوە، بەڵام دەوڵەمەندەکان هیچ ناوێکیان نییە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٧٩)

## قەرزی باوک لەسەر منداڵ

منداڵێك، دوای ئەوەی کە گەورە دەبێت و دەبێتە گەنج، بە باوکی دەڵێ: دەمەوێ پاداشتی چاکەکانت بدەمەوە، باوکیشی دەڵێ باشە کوڕم، تۆپەکەت هەڵگرە .. با بڕۆینە سەرگردی نزیك ماڵەکەمان!!!

باوك و کوڕەکە چوونە سەر گردەکە، باوکەکە تۆپەکەی لە وێوە هەڵدایە خوارەوە، ئینجا بە کوڕەکەی گوت: بڕۆ بیهێنەرەوە!!!

کوڕەکەی چوو تۆپەکەی هێنایەوە، باوکەکە دیسان هەڵیدایەوە بۆ خوارەوە، ئەم جارەشیان بە کوڕەکەی گوت هەستە بڕۆ بیهێنەرەوە!!!!!

کوڕەکە بەناچاری چوو تۆپەکەی هێنایەوە!!!!

بۆ جاری سێیەم باوکەکە تۆپەکەی هەڵدایەوە و، داوای لە کوڕەکەی کرد کە بیهێنێتەوە!!!!!!

بەڵام ئەم جارەیان کوڕەکە گوتی: بابەگیان ئیدی ناتوانم بچم بیهێنمەوە!!!!!

باوکی گوتی: کوڕە شیرینەکەم، کاتێ کە منداڵ بووی، هەموو ڕۆژێ من و تۆ پێکەوە دەهاتینە سەر ئەم گردە و، تۆ تۆپەکەت هەڵدەدایە خوارەوە، منیش بۆ ئەوەی دڵت خۆش بێت و خەیاڵت ئاسوودە بێت و دەروونت ئارام بێت، دەچووم دەمهێنایەوە سەرەوە!!!!!

بەڵام تۆ تەنیا بۆ ڕۆژێکیش بەرگەی ئەو ئازار و ماندووبوونەت نەگرت، کە من لە پێناو بەختەوەری تۆدا دیومە، ئەمەیە جیاوازی نێوان من و تۆ و باوك و منداڵ.

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- کەس ناتوانێ قەرزی دایك و باوکی بداتەوە، ئەگەر چەندیش دەوڵەمەند بێت.
- ئەو ئارامی و دانبەخۆداگرتنەی دایك و باوك هەیانە بەرامبەرە بە منداڵەکانیان، منداڵەکانیان نییانە بەرامبەر بە ئەوان.
- ئەوەی ڕابردووی خۆی نەزانێت، ناتوانێ ئێستا و داهاتووی خۆی بنیاد بنێت.
- دایك و باوکەکان وەك مۆم خۆیان دەتوێننەوە، بۆ ئەوەی منداڵەکانیان لە رووناکیدا بژین، بەڵام منداڵەکان ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نییە ئەم قوربانییە لە پێناو دایك و باوکیان بدەن.
- ...................................................
- ...................................................
- ...................................................

## چیرۆکی

## (٨٠)

## تکایە گاڵتە بە کەس مەکە

کورێکی گاڵتەچی، بەم شێوەیە بەسەرهاتی خۆی و کەسێکی نابینا دەگێڕێتەوە: تا ئێستاش ئەو شەوەم هەر لە یادە.. لە تەک هاوەڵەکانما، تا پاش نیوە شەو لە بەزم و ڕەزم و قاقای پێکەنینا بووین و خێزانیشم بە تەنیا لە ماڵ جیهێشتبوو! خێزانەکەم سکی نۆ مانگانە بوو، چاوەڕوانی منداڵبوون بوو..

ئای ئەو شەونشینییە، چ شەونشینییەک بوو!! پڕبوو لە باسکردنی ئەم و ئەو، پڕ بوو لە قسەی بێ ناوەڕۆک و تونێکڵی بێ ناوک.. ئەگەر بڵێیت تاوانەکە هەمووی هی من بوو.. من باسی خەڵکم دەکرد و لاساییم دەکردنەوە و دەمهێنانە پێکەنین، ئەو شەوەش زۆرم هێنانە پێکەنین، توانایەکی سەیرم لە لاسایی کردنەوەدا هەبوو، توانام هەبوو دەنگی خۆم وەک دەنگی لاسایی کراوەکە لێبکەم! بەڵێ، زۆرگاڵتەم بەم و بەو دەکرد، لاساییم دەکردنەوە، دەتوانم بڵێم: کەس لە دەستم ڕزگاری نەدەبوو، بگرە هاوەڵە نزیکەکانیشم.. وام لیهاتبوو هەندی کەس لێم دوورەپەرێز دەبوون، تا لە زمانم پارێزراو و بێوەی بن!!!!!

ئەو شەوە باش لە یادمە، بابەتی گاڵتەکەم کوێرێک بوو.. ئەو هەژارە لە ناو بازاڕا سواڵی دەکرد، منیش نەک هەر گاڵتە و مەسخەرەم پێدەکرد،

زیاد لەوە پێم نایە بەر پێی و هەڵکەوت و بەسەراکەوت.. و نەی دەزانی چی بکات؟! تەنیا هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە!!! منیش لەولاوە پێی پێ دەکەنیم و قاقام ئەو ناوەی پڕ کردبوو..

منی دڵڕەق، وەک هەمیشە، پاش نیوەشەو بۆماڵەوە گەڕامەوە، دیتم خێزانم چاوەڕوانمە.. لە حاڵێکی شپرێو دابوو!!! بەدەنگێکی پڕ لە خەم و خەفەتەوە گوتی: ڕاشید! ئەوە لە کوێ بوویت؟!

منیش بە مەسخەرەیەکەوە گوتم: بۆچ نازانی؟ لە مەریخ بووم! وەک عادەتی خۆم لای هاوەڵەکانم بووم..

ماندوویی بە ڕوو و ڕواڵەتییەوە دەبینرا، بەدەنگێکەوە، کە گریان گەرووی گرتبوو، گوتی: دەزانی من زۆر ماندووم! پێدەچی کات و ساتی منداڵبوونەکەم زۆر نزیک بوویێتەوە؟! لەگەڵ ئەوەشا، تنۆکی فرمێسکی خەماوی بە بێدەنگی بەسەر ڕوومەتە هەڵپڕوکاوەکانییا دەکەوتە خوارەوە.. ئیتر هیچی نەوت و بێدەنگ بوو..

ویژدانم جووڵا و هەستمکرد لە بەرامبەریەوە زۆر کەمتەرخەم بووم، دەبوو بایەخی زۆرترم پێ بدایە و لەم مانگانەی دواییدا شەونشینییەکانم لە دەرەوە کەمتر بکردایەتەوە.. بەگورجی بۆ خەستەخانەم برد، دکتۆرەکە لەگەڵ بینینی، ناردی بۆ ژووری منداڵبوون.. بەڵێ، ڕۆیشتە ژووری منداڵبوونەوە.. چەندان سەعات بە ئازارەوە دەیناڵاند!! منیش بە ئارامییەکی زۆرەوە چاوەڕوانی ڕزگاربوون و هاتنە دەرەوەی بووم.. منداڵبوونەکەی زەحمەت بوو.. ئەوەندە چاوەڕوانیم کرد تا ماندووبووم!!

ژماره تەلەفونی ماڵی خۆمانم لا جێهێشتن، بۆ ئەوەی هەر کاتێ منداڵەکەی بوو، مزگێنیم پێ بدەن، و بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە!!

پاش ماوەیەک لە گەڕانەوەم، تەلەفۆنیان بۆ کردم، کە گورج بگەمە نەخۆشخانە..خێرا ڕاپەڕیم و زوو خۆم گەیاندە نەخۆشخانە، لە پرسگەکە پرسیاری ژوورەکەیم کرد کە: لە چ ژوورێکن؟

گوتیان: جارێ سەر لەو دکتۆرەیە بدە، کە سەرپەرشتی منالبوونەکەی کردووە، منیش زۆر دڵگران بووم و هەندێ قیڕاندم، گوتم: منداڵەکەم!! گوتیان: جارێ تەشریف ببە لای ئەو دکتۆرە.. منیش ڕۆیشتم بۆلای دکتۆرەکە.. و هەواڵی خێزانم و مناڵەکەمم لێ پرسی.. ئەویش سەرەتا باسی قەزا و قەدەری بۆکردم و گوتی: لە ژیاندا، هەندی شت لە دەرەوەی حەز و ویستی مرۆڤ ڕوو دەدەن، تەنیا چارەسەریش بۆ ئەو جۆرە حاڵەتانە، ئارام گرتنە!!

منیش گوتم: بۆچی دکتۆر چی بووە، چی قەوماوە؟

گوتی: منداڵەکەتان بە نابینایی لە دایك بووە!!!!

منیش ئاخێکی ساردم هەڵکێشا و ئەو شەوەم بەبیرهاتەوە کە گاڵتەم بەو نابینایە دەکرد و زانیم ئەمە تۆڵەی خوداییە و هەر لە دونیا، ئەوەی کە چاندم، چنیمەوە!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ مرۆڤ گاڵتە بە کەس بکات و بە چاوێکی کەم سەیری کەس بکات.
- مرۆڤی لەخۆبایی، چەندە بەرز بفڕێت، هێندە خێرا دەکەوێت بە زەویدا.
- دەبێ مرۆڤ خۆی لە ستەم و تاوان بپارێزێت، چونکە دوعای ستەملێکراو لای پەروەردەگار ڕەت ناکرێتەوە و گیرا دەبێت.
- مرۆڤ لە دەرگای کێ بدات، لە دەرگای دەدرێتەوە.
- هاوڕێ و هاونشینی خراپ، هەمیشە هانی مرۆڤ دەدات بۆ کاری خراپ و نەشیاو.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٨١)

## سۆزی بێ باوکێک

رۆژێک منداڵێک دەچێت بۆ ماڵی هاورێکەی، بۆ ئەوەی پێکەوە یاری بکەن، هاورێکەی پێی دەڵێت: هێواش دەنگە دەنگ نەکەیت، با باوکم لە خەو هەڵنەستێت! منداڵەکەش پێی دەڵێت: وەرە با بڕۆین لە تەنیشت گۆڕەکەی باوکم یاری بکەین، بەشکم لە خەو هەڵدەستێت!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- تەنیا هەتیوەکان(بێ باوکەکان)، بە تەواوی قەدری باوك دەزانن، چونکە هەست بە کەلێنێکی زۆر دەکەن.
- پێویستە رێز لە هەستی بێ باوکەکان بگرین.
- دەبێ چێژ لەو ساتانە وەربگرین کە لەگەڵ کەسوکارەکانماندا دەژین و رێزیان بگرین و دڵیان نەشکێنین.
- ئەستەمە هیچ کەسێك شوێنی باوك بگرێتەوە، بۆیە هەیتوەکان هەمیشە چاویان لە گەرانەوەی باوکیانە.
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٨٢)

## پیاوێکی ڕەزیل

پیاوێکی ڕەزیل، هاوڕێیەکی خۆشەویستی بووە میوانی!

ئەویش کوڕەکەی بانگ کرد و پێی گوت:

کوڕم، میوانێکی زۆر خۆشەویستم هاتووە، بڕۆ لە بازاڕ، نیو کیلۆ گۆشتی زۆر جوان بکڕە.

کوڕەکە ڕۆیشت و دواتر بەدەستی خاڵی گەڕایەوە!

باوکی گوتی: کوڕم کوا گۆشتەکەت؟

کوڕەکە گوتی: چوومە لای قەساب.

گوتم: جوانترین گۆشتم بدەرێ..

ئەویش گوتی: دەبێ گۆشتێکت بدەمێ، وەکو پەنیر جوان بێ.

منیش لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەی بۆ لە جێی گۆشت نەچم پەنیر بکڕم؟!!! دواتر چوومە لای دوکانی پەنیر فرۆش، گوتم : جوانترین پەنیرم بدەرێ.

ئەویش گوتی: پەنیرێکت دەدەمێ، وەک هەنگوین وابێت.

منیش گوتم : ئەگەر وایە، بڕۆم هەنگوین بکڕم باشترە..چوومە لای هەنگوین فرۆش و گوتم: باشترین جۆری هەنگوینم دەوێ.

ئەویش گوتی: هەنگوینێکت دەدەمێ، وەکو ئاوی ڕوون وابێت.

منیش گوتم: ئەگەر وایە، خۆمان لە ماڵەوە ئاوی ڕوونمان هەیە!!

هەر بۆیە بەدەستی بەتاڵ گەڕامەوە!!!

باوکە ڕەزیلەکەیشی پێی گوت: ئەی چەند کوڕێکی زەرەرمەندی، شتێکت زەرەر کردووە.

کوڕەکە گوتی: چییە بابە؟!!!!!

باوکە ڕەزیلەکەی گوتی: ئەوەندە ئەم دوکان و ئەو دوکانت کردووە، پێڵاوەکانت خراپ بووە!!!

کوڕەکەش گوتی: بابە خەمت نەبێ، پێڵاوی میوانەکەمانم بردبوو!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مخابن! کەسانی ڕەزیل، بە ڕەزیلی دەژین، بەڵام بە دەوڵەمەندی دەمرن!
- دایك و باوك، سەرمەشقن بۆ منداڵەکانیان، بۆیە زۆربەی جار، ئەگەر باش بن، ئەوانش باش دەبن، بەڵام ئەگەر خراپ بن، ئەوانیش لاسایی ئەوان دەکەنەوە.
- میوان لە فەرهەنگی گشت میللەتاندا ڕێزدار و خۆشەویستە، بۆیە ڕێزگرتن لە میوان، نیشانەی تێگەیشتن و پێگەیشتن و مرۆڤدۆستییە.
- ................................................
- ................................................
- ................................................

# چیرۆکی

## (٨٣)

## لە یاداشتەکانی خوێندکارێک

قوتابییەك، بەم شێوەیە بەسەرهاتی خۆی و باوکی دەگێڕێتەوە:

من قەدری ئەو پارانەم نەدەزانی، کە باوکم بۆ خوێندنی تایبەت، بۆی تەرخان دەکردم.

بۆیە ڕۆژانە، بێ ئاگاداریی باوکم بڕێك لەو پارانەم دەبرد و پێی دەچوومە سینەما..!!!

تا ئەو ڕۆژەی لەبەر دەرگای سینەمادا گوێم لێبوو، باوکم بەخاوەنی سینەماکەی دەگوت: کارێکی پاش دەوامم دەدەنێ لێرە کار بکەم؟!!!

چونکە دەمەوێ پارە بۆ کوڕەکەم کۆبکەمەوە بۆ خوێندنی تایبەت!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- لە پاڵ هەر قوتابییەکی زیرەك و ئازا، باوکێکی خەمخۆر و دڵسۆز و ماندوونەناس هەیە.
- پێویستە مرۆڤ لە خەرجکردندا مامناوەند بێت، نە ئەمپەڕ بکات نە ئەوپەڕ....
- باوك ئامادەیە دوو شیفت کار بکات، بۆ ئەوەی خەونەکانی منداڵەکانی بێنێتە دی.
- نابێ مرۆڤ فێڵ لە دایك و باوکی بکات، چونکە فێڵبازی، ڕووڕەشی و شەرمەزارییە...
- ئەگەر مرۆڤ پەی بە هەڵەی خۆی برد، دەبێ دووبارە و چەند بارەی نەکاتەوە.
- ......................................................
- ......................................................
- ......................................................

## چیرۆکی

## (٨٤)

## تیرۆرکردنی تواناکان

جەنابی سەرپەرشتیار، بەڕێوەبەری یەکێك لە قوتابخانە بنەڕەتییەکانی شارۆچکەیەکی ئاگادارکردەوە، کە بەنیازی سەردانی قوتابخانەکەیانە، ئەو ڕۆژە کە بەرەو قوتابخانەکە بەڕێکەوت، لە ڕێگەدا ئۆتۆمبێلەکەی تووشی گرفتێك هات، کە لە ئەنجامدا لەکار کەوت، ئەویش بە سەرسامییەوە لە نزیك ئۆتۆمبێلەکەی ڕاوەستا و نەیدەزانی چی بکات!!!

لەو کاتەدا، کە سەرپەرشتیار بەوپەڕی نیگەرانییەوە لە ناچاریدا لە نزیك ئۆتۆمبێلەکەیەوە وەستابوو، قوتابییەك بەوێدا تێپەڕی و چاوی پێکەوت، زانی کە ئۆتۆمبێلەکە گرفتێکی تێدایە و لە کارکەوتووە، لە جەنابی سەرپەرشتیار نزیك بووە و دوای سڵاو، پرسی: دەتوانم یارمەتیت بدەم و هاوکاریت پێشکەش بکەم؟

سەرپەرشتیاریش لەم قەیرانەدا لە وەڵامدا گوتی: هیچ لە چاککردنەوەی ئۆتۆمبێل دەزانیت؟

قوتابییەکە زۆر درێژەی بە وەڵامی پرسیارەکەی نەدا و یەکسەر بۆنیتی ئۆتۆمبێلەکەی هەڵدایەوە و دەستی بەکاری خۆی کرد و پاش ماوەیەك،

داوای له جەنابی سەرپەرشتیار کرد که ئۆتۆمبێلەکەی بخاتەگەڕ، ئۆتۆمبێلەکە کەوتەوە کار و سەرپەرشتیارەکە لەم کێشەیە ڕزگاری بوو.....

سەرپەرشتیارەکە بە گەرمی سوپاسی قوتابییەکەی کرد، بەڵام ویستی نهێنی ئەوە بزانێت کە بۆچی ئەو قوتابییە لەم کاتەدا لە قوتابخانە نییە و لێرە چی دەکات؟

قوتابییەکە لە وەڵامدا گوتی:(ئەمڕۆ جەنابی سەرپەرشتیار سەردانی قوتابخانەکەمان دەکات، منیش لە پۆلەکەدا تەنبەڵترین قوتابیم، لەبەر ئەوە مامۆستاکەم پێی گوتم: بڕۆماڵەوە، بۆ ئەوەی (خەجاڵەتمان نەکەیت)!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هەموو قوتابییەك، بەهرەیەکی هەیە، بەڵام دەبێ ئەو بەهرە بدۆزرێتەوە و بخرێتە گەڕ و کاری پێ بکرێت.
- ژیری بە گەورەیی و بچووکی نییە.
- ئەگەر کەسێك لە ڕێگە پەکی کەوت، دەبێ مرۆڤ بەهانایەوە بچێت.
- پێش ئەوەی مامۆستا، فێرکار بێت، دەبێ پەروەردەکار بێت و، قوتابی نەشکێنێتەوە و کارێکی وا نەکات واز لە قوتابخانە بێنێت.
- دەبێ چەند قوتابی بەهرەمەند و تواناداری ئاوامان هەبێت، کە ڕۆژانە لێرە و لەوێ لەلایەن دایباب و سەرپەرشتیار و ڕاهێنەر و مامۆستاکانیانەوە، بەهرەو تواناکانیان تیرۆر دەکرێت و کەسیش لێیان ناپێچێتەوە و ئاوڕیان لێناداتەوە و بەهانایانەوە ناچێت؟!!!

## چیرۆکی

## (٨٥)

## باوەڕ بەخۆبوون

لـە یـەکێک لـە زانکۆکـانی کۆڵۆمبیـا، خوێنـدکارێک لـە بەشـی بیرکاری (ماتماتیك)، دەیخوێند...

ڕۆژێکیان، لە ناو پۆڵ، لە پشتەوە دانیشتبوو و خەوی لێکەوتبوو!!!

لە کۆتایی وانەکە، لە دەنگی خوێندکارەکان خەبەری بۆوە.

سەیری سەر تەختە ڕەشەکەی کرد، بینی مامۆستاکەیان دوو نموونەی شی نەکراوی بۆ خوێندکارەکان لەسەر تەختەکە نووسیوە!

بە پەلە هەردوو نموونەکەی لەسەر کاغەزێک نووسییەوە و گەڕایەوەماڵەوە، دەستی بە بیرکردنەوە کرد بۆ شیکردنەوەی دوو پرسیارەکە!!!

دوو پرسیارەکە زۆر قورس بوون، بۆیە چوو بۆ کتێبخانەی زانکۆ، ئەو کتێبانەی کە پێویست بوون وەریگرتن!!

دوای چوار ڕۆژ، تـوانی هـەردوو پرسـیارەکە لـە چـوار پـەڕەدا شـیکار بکات!!

لە وانەی داهاتووی بیرکاری، خوێندکارەکە سەیری مامۆستاکەی کرد کە داوای شیکاری ئەو پرسیارانە ناکات، بۆیە سەری سوڕما!!

دواتر بە مامۆستاکەی گوت: کە ئەو چوار ڕۆژە خەریکی شیکارکردنی ئەو دوو پرسیارە بووە لە چوار پەڕدا!!!

مامۆستاکەیشی، بەسەر سوڕمانییەوە گوتی: بەڵام من داوام لە ئێوە نەکردووە کە هیچ پرسیارێك شیکار بکەن!!!

تەنانەت ئەو دوو پرسیارەش کە پیشانم داون، نموونەی ئەو پرسیارانەیە، کە ئاڵۆز و سەختن و تا ئێستا لەلایەن زانایانەوە شیکار نەکراون و لەوبارەیەوە نەگەیشتوونەتە ئەنجامی کۆتایی!!!

بێگومان، ئەگەر ئەو خوێندکارەش لە کاتی وانەکەیدا، بەخەبەر بوایە و گوێی لە ڕوونکردنەوەی مامۆستاکەی بوایە، بەدڵنیاییەوە وەك خوێندکارەکانی دیکە، هەوڵی شیکردنەوەی ئەو دوو پرسیارەی نەدەدا!!

بەڵام ئەوەی جێگەی دڵخۆشییە، تا ئێستاش ئەو دوو پرسیارە بە چوار پەڕەکەیەوە لەو زانکۆیە هەڵواسراون!!!!

بە دڵنیاییەوە، متمانە و باوەڕ بەخۆبوون بوو،کە وایکرد ئەو خوێندکارە بگاتە ئەنجامێکی دڵخواز و ئەو گرێکوێرەیە بکاتەوە!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هیچ گرێکوێرەیەك نییە کە نەکرێتەوە، هیچ دەردێك نییە کە دەرمان نەکرێت، هیچ زامێك نییە، کە سارێژ نەکرێت، هیچ کێشەیەکیش نییە، کە چارەسەر نەکرێت، بۆیە پێویستە کۆڵنەدەین و لە کار و کۆشش نەوەستین!!!!
- کەسی وا هەیە خاوەن توانا و بەهرەیەکی پەنهان و شاراوەیە، جا دۆزینەوەی ئەو بەهرە و توانایە، دەبێتە خاڵی سەرکەوتنی ئەو کەسە.
- مرۆڤ چەندە زانا بێت، کەسێکی لە مرۆڤ زاناتر هەیە، بۆیە نابێ زاناکان لەخۆبایی ببن.
- ...............................................
- ...............................................
- ...............................................

# چیرۆکی
## (٨٦)
## دەوڵەمەندێکی نەزان

دەوڵەمەندێکی کەنداو(خەلیج)، بەمەبەستی خوێندن، کوڕەکەی دەنێرێتە وڵاتی ئەلمانیا، دوای مانگێك، باوکی ئەو کوڕە، نامەیەکی لە کوڕەکەیەوە پێ دەگات، ناوەڕۆکی نامەکەی ئەمە بوو:(بابەگیان، بەرلین، بێ ئەندازە شارێکی خۆشە، خەڵکەکەیشی زۆر لەگەڵم چاك و باشن، بەڕاستی من لێرە زۆر ئاسوودەم، بەڵام کەمێك هەست بە شەرمەزاری دەکەم، چونکە ڕۆژانە بە مارسێدسەکەم دەچمە زانکۆ، کەچی مامۆستاکانم بە شەمەندەفەر هاتوچۆ دەکەن).

دوای ماوەیەك، باوکی ئەو کوڕە، چەکێکی یەك ملیۆن دۆلاری، لەگەڵ نامەیەکی بۆ کوڕەکەی نارد، لە نامەکەیدا ئاوا نووسیبووی:(کوڕی شیرینم، چیتر شەرمەزارمان مەکە، تۆش بڕۆ وەك مامۆستاکانت شەمەندەفەرێك بۆ خۆت بکڕە)!!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مەرج نییە هەر کەسێك پارە و پووڵی هەبێت، کەسێکی زانا و دانا بێت، بە پێچەوانەوە، زۆر جار پارە و پووڵ رێگرە لەبەردەم خۆتێگەیاندن و خۆپێگەیاندن.
- هیچ بەلایەك لە تێنەگەیشتن و نەزانین گەورەتر نییە، چونکە نەزانین سەرچاوەی هەموو کێشەکانە.
- نابێ مرۆڤی دەوڵەمەند، بە فیز و دەعیە بێت و، بەسەر ئەم و ئەو و فلان و فیساردا خۆی هەڵکێشێت.
- مرۆڤ بە پارە و پووڵ پێشناکەوێت، بەڵکو بە زانست و مەعریفە پێشدەکەوێت، چونکە دەوڵەمەندی نیشانەی تێگەیشت نییە، هەژاریش نیشانەی تێنەگەیشتن نییە.
- ...............................................
- ...............................................
- ...............................................

## چیرۆکی

## (٨٧)

## بێ ئومێد مەبە، دەکرێت ئەسپیش بفڕێت

پاشایەك، بەهۆی تاوانێکەوە، کە ئەنجامیان دابوو، سزای لە سێدارەدانی بەسەر دوو کەسدا سەپاند، کاتی جێبەجێکردنی حوکمەکەیان دیاری کرا، کە بریتی بوو لە مانگێك.

لە پاش دەرچوونی حوکمەکە، یەکێك لە زیندانییەکان، بە تەواوەتی ورەی ڕووخا و بێ ئومێد بوو و خۆی بەدەستەوەدا، بۆیە لە سووچێکی زیندانەکەدا دەگریا و، چاوەڕێی ڕۆژی لە سێدارەدان بوو!!!! بەڵام ئەویتریان، زیرەك و وریا بوو، بیری لەوە دەکردەوە کە ڕێگە چارەیەك بدۆزێتەوە، بەمەبەستی ڕزگار بوون لە سزای لە سێدارەدان، یان بەلایەنی کەمەوە جێبەجێکردنی سزاکە دواکەوێت و بتوانێت ماوەیەکی زیاتر بژیت. شەوێکیان لەناو زینداندا دانیشت و بیری کردەوە، ئایا پاشا میزاجی چۆنە و حەزی لە چییە و ڕقیشی لە چییە و چیشی خۆش دەوێت، لەو ساتە وەختەدا بیری کەوتەوە، کە پادشا ئەسپێکی هەیە و ئەسپەکەی زۆر خۆشدەوێت و، زۆربەی کاتەکانی خۆی بۆ تەرخان کردووە . بیرۆکەیەکی گرنگ و ناڵۆزی بە بیردا هات و داوای لە پاسەوانی زیندانەکە کرد، کە پاشا بۆ کارێکی زۆر گرنگ ببینێت.

پاشا ڕازی بوو چاوی پێ بکەوێت و لەبارەی ئەو کارە گرنگەی کە هەیبوو، گوێی لێ بگرێت.

زیندانییەکە گوتی: جەنابی پاشا، من دەتوانم لە ماوەی ساڵێکدا ئەسپەکەت فێری فڕین بکەم، بەڵام بەمەرجێك حوکمی لە سێدارەدانەکەم بۆ ماوەی ساڵێك دوابخەیت..

پاشا ڕەزامەندی نیشان دا لەسەر داواکارییەکەی، چونکە بیری لەوە دەکردەوە کە دەبێتە یەکەم کەس لە جیهاندا، کە سواری ئەسپی فڕیو بێت!!!!!!!!

پاسەوانی زیندانەکە،کە گوێی لەم قسانە بوو، سەری سوڕما!!!

بۆیە بە چپە و سرتە بەو زیندانییەی گوت: تۆ چاك دەزانیت کە ئەسپ نافڕێت!! ئیتر چۆن وێرایت ئەو بیرۆکە شێتانەیە بۆ پاشا پێشنیاز بکەیت ؟

زیندانییەکە وەڵامی دایەوە و گوتی: منیش ئەوە دەزانم، بەڵام چوار هەڵ و دەرفەتم بۆ دەڕەخسێ، تا بەهۆی یەکێك لەو هەڵ و دەرفەتانە، لە سزای لە سێدارەدان ڕزگارم بێت، ئەو چوار هەڵ و دەرفەتەش بریتین لەمانە:

یەکەم: دوور نییە لە ماوەی ئەو ساڵەدا پاشا بمرێت.

دووەم: لەوانەیە لەو ماوەیەدا خۆم لەسەر جێگا بمرم، کە ئەمەم پێ باشترە لەوەی کە لە سێدارە بدرێم.

سێیەم: لەوانەیە ئەسپەکە بمرێت.

چوارەم: لەوانەیە بتوانم ئەسپەکە فێری فڕین بکەم!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- لەم چیرۆکەوە فێری ئەوە دەبیت، کە کاتێ ڕووبەڕووی هەر گرفتێك دەبیتەوە، بێ هیوا و ئومێد مەبە و، خۆت مەبەستەرەوە بە تاکە چارەسەرێکەوە، بەڵکو کار بە مێشکت بکە و بیر بکەرەوە، نەك ڕێگەیەك، دەیان ڕێگە بدۆزەرەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانت، دەشێت لە یەکێکیاندا سەرکەوتن بەدەست بهێنیت، بەمەش هیچ شتێك نادۆڕێنیت.
- مرۆڤ تا لە ژیاندا ماوە، دەبێ لە کار و کۆشش نەوەستێ، چونکە مەرگی مرۆڤ لەو خاڵەوە دەستپێدەکات، کە لێی دەوەستێت.
- خوا، بۆیە مێشك و عەقڵ و هزری بە مرۆڤ بەخشیوە، تا بیریکاتەوە، نەك لە ئاست کێشەکاندا دەستەوەستان بوەستێت.
- زۆر جار زەمەن دەبێتە هۆکارێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (٨٨)

## پەرداخێک شیر!!!

هیوارد کیلی، ئەو منداڵە هەژارەی کۆڵان بە کۆڵان و ماڵ بە ماڵ دەگەڕاو شمەکی دەفرۆشت، تا خەرجی خوێندنەکەی دەستبخات.. ڕۆژێکیان برسێتی تەنگی پێ هەڵچنی، دەستیکرد بە گیرفانەکانیدا، تەنها دە سەنتی پێبوو، لەبەر ئەوە بڕیاری دا.. هەر کە بە یەکەم ماڵ گەیشت، داوای کەمێک خواردن بکات.. بەڵام کاتێک لە دەرگای یەکەم ماڵی دا، کچێك دەرگاکەی کردەوە، زۆر شەرمی کرد.. لەبری ئەوەی داوای ژەمە خۆراکێك بکات، داوای پەرداخێك ئاوی کرد.

کاتێکیش کچەکە، ڕەنگی زەرد و پەڕیوی برسێتی، لە ڕوخساری منداڵەکەدا بینی.. پەرداخێك شیری بۆ هێنا. ئەویش یەکسەر شیرەکەی نۆش کرد و لە کچەکەی پرسی: ئای دەبێت چەندە قەرزداری تۆ بم؟! نازانم چۆن پاداشتی ئەم چاکەیەت بدەمەوە؟!

کچەکە وەڵامی دایەوە: تۆ هیچ شتێك بە من قەرزدار نیت.. چونکە دایکم فێری کردووین، لە بەرامبەر چاکەدا، هیچ نرخێك وەرنەگرین.

منداڵەکە گوتی: کەواتە لە کانگای دڵمەوە سوپاست دەکەم.. کاتێ کە ماڵی کچکەشی جێهێشت.. هەستی بە دڵئاسوودەیی کرد و بڕوا و

متمانەشی بە خوا و پاشان مرۆڤدۆستی زیادی کرد.. لە کاتێکدا پێشتر هەستی بە پەستی و بێهوایی دەکرد!!!

دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێك، ئەو کچەی پەرداخە شیرەکەی دابوو بە منداڵەکە.. تووشی نەخۆشییەکی مەترسیدار بوو. هەموو پزیشکەکانی ئەو ناوچەیە، لە چارەسەرکردنیدا دەستەوستان بوون.. بۆیە بە ناچاری ڕەوانەی نەخۆشخانەی شاریان کرد.. لەوێ بۆ پشکنینی نەخۆشییە دەگمەنەکەی، پزیشکە شارەزاکانیان بانگکرد.. دکتۆر (هیوارد کیلی)ش، بۆ ڕاوێژکاری پزیشکی بانگهێشت کرابوو.. کاتێك ناوی ئەو شارەی ئافرەتەکەی لێوە هاتبوو، بیست.. چاوی بە شێوەیەکی سەیر بریسکایەوە و دەستبەجێ هەستایە سەر پێ و بە پۆشاکی پزیشکییەوە بەرەو نهۆمی خوارەوە ڕۆیشت.. تا چاوی بە نەخۆشەکە بکەوێت.. هەرکە چاوی پێ کەوت، ناسییەوە.. دەرگای ژوورەکەی پێوە دایەوە و ڕووی کردە ژووری پزیشکەکان.. بڕیاری دا هەرچی لە توانایدا بێت، بیخاتە گەڕو هیچ درێغی نەکات.. تا ژیانی ئەو ئافرەتە ڕزگار بکات.. لەو ڕۆژەوە بایەخێکی تایبەتی بە باری تەندروستی ئەو ئافرەتە دا.

پاش کێشمەکێشمێکی دوور و درێژ، ئەرکی پێڕاگەیشتن بەو نەخۆشە، بە باشترین شێوە، ئەنجام درا.. دکتۆر (هیوارد کیلی)ش داوای کرد کەوا پسووڵەی خەرجی نەخۆشەکە، بهێننە نووسینگەی ئەو.. تەماشایەکی کرد.. لە دامێنیدا شتێکی نووسی و ڕەوانەی ژووری نەخۆشەکەی کرد.. ئافرەتە نەخۆشەکە نەیدەوێرا تەماشای پسووڵەکە بکات.. چونکە دەیزانی،

تا کۆتایی ژیانی، دەبێت نرخی ئەم پسوولەیە بداتەوە.. بەڵام لە کۆتاییدا تەماشای کرد.. ئەو شتەی لە دامێنی پسوولەکەدا نووسرابوو، سەرنجی ڕاکێشا.. ئەم وشانەی لێ خوێندەوە:(تەواوی خەرجییەکەت، لەبەرامبەر پەرداخە شیرێکدا دراوە)!!!

واژۆ: دکتۆر (هیوار کیلی)!!!

فرمێسکی شادی لە چاوەکانی هاتنە خوارێ.. بەدڵێکی خۆشەوە ئەم گوتانەی دەگوتەوە: خوایەگیان سوپاست دەکەم.. سوپاسی ئەو سۆز و خۆشەویستییە بێ ئەندازە و نەرم و نیانییە گشتگیر و بەرفراوانەت دەکەم.. کە ڕژاندووتە ناو دڵ و هەست و دەستی مرۆڤەکانەوە.

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هەردەم لە ئاست کاری چاکەدا، خەمسارد و کەمتەرخەم مەبە، لە بیریشت بێت: چیت بەخشیوە، ئەوە وەردەگریتەوە.. ئەگەر لەم دونیاش پێت نەدرێتەوە، دڵنیابە ڕۆژێك دادێت.. چاکتر لەوەی بەخشیوتە، پێت دەدرێتەوە.
- نابێ مرۆڤ لە ژیاندا بێ وەفا و ئەمەك بێت، بەڵکو دەبێ چاکەی چاکەکارانی لە بیر بێت.
- دایك و باوك ڕۆڵێکی مەزن و گەورەیان هەیە لە پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان، بۆیە دەبێ چاوساغ و پێشەنگ بن بۆ کاری چاکە و خێر.

## چیرۆکی

## (٨٩)

## دکتۆرێکی دڵسۆز و فیداکار

دوای ئەوەی پیاوێک، کوڕە تاقانەکەی تووشی رووداوی ئۆتۆمبێل دەبێ و بە سەختی بریندار دەبێ.

دەگەیەندرێتە نەخۆشخانەیەکی تایبەت و لە نەخۆشخانەوە، پەیوەندی بە پزیشکی پسپۆڕەوە دەکرێ، کە بەپەلە ئامادە بێت.

دکتۆر زۆر بە پەلە گەیشتە نەخۆشخانە، بۆ ئەوەی خێرا نەشتەگەری بۆ منداڵەکە ئەنجام بدات.

پێش ئەوەی بچێتە هۆلی نەشتەرگەری، باوکی منداڵەکەی بینی، دەهات و دەچوو، دیار بوو زۆر نیگەران بوو...!!!!

باوکی منداڵەکەش، کاتێک دکتۆرەکەی بینی، بەسەریدا هاواری کرد و گوتی: لەبەرچی ئاوا دەرنگ هاتی، نازانی ژیانی منداڵەکەم لە مەترسیدایە؟!!!

دکتورەکەش بە ئارامی گوتی: لەسەرخۆبە براگیان، من لە نەخۆشخانە نەبووم، کاتێ خەبەریان دامێ، زوو گەیشتمە ئێرە، ئێستاش لەسەرخۆبە و ئارام بگرە!!!

باوکی منداڵەکە گوتی: ئارام بگرم؟!!!

ئاخ! تۆ دکتۆرێکی چەندە خەمساردی!! باشە ئەگەر کوڕەکی تۆ بوایە وات دەگوت؟!!!

دکتۆرەکە زەردەخەنەیەکی کرد وگوتی: لەکاتی ڕووداو وکارەساتەکان، دەبێ مرۆڤ ئارام بگرێ، ئەوەی خوا حەز بکات هەر ئەوە دەبێت، چونکە ژیان بە دەست خوایە، دکتۆر ناتوانێ تەمەنی هیچ نەخۆشێك درێژ، یان کورت بکاتەوە، بەڵام دڵنیابە ئەوەی پێوست بێت بۆ کوڕەکەت دەیکەین.

جا باشتر وایە لە جیاتی خۆ تووڕەکردن، دەستنوێژێك بگری و دوعای چاکبوونەوە بۆ منداڵەکەت بکەیت!!!

باوکی منداڵەکە بە گاڵتە پێکردنێکەوە سەری بۆ دکتۆرکە بادا،

دکتۆر چووە ژووری نەشتەرگەری، پاش ماوەیەک، هاتە دەرەوە وگوتی: براکەم مژدە بێت، ئێستا حاڵی کوڕەکەت زۆر باشە، نەشتەرگەریەکەی سەرکەوتوو بوو!!!!!

ئێستا من درەنگمە، دەبێت بڕۆم،کارێکی گرنگم هەیە، دواتر یاریدەدەرەکەم بە دوور و درێژی باسی ڕەوشی منداڵەکەت بۆ دەکات.

کاتێ منداڵەکەیان لە ژووری نەشتەرگەری هێنایە دەرەوە، باوکی کوڕەکە، بە یاریدەدەری دکتۆرەکەی گوت: ئەو دکتۆرە زۆر لەخۆباییە، ڕانەوەستا تاکو لەبارەی ڕەوشی تەندروستی کوڕەکەم هەندێ پرسیاری لێ بکەم !!!!

یاریدەدەری دکتۆرەکە، چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و گوتی:

دوینــێ شـەو کـوڕەکەی دکتـۆر، لە ڕووداوێکـی دڵـتەزێن گیـانی لە دەستدابوو، ئەمڕۆ خەریکی ناشتنی کوڕەکەی بوو!!! لەبەر ئەوەی تاکە دکتۆرە لە نەخۆشخانەکەمان ئەو پسپۆرییەی هەبێت، بەناچاری تەلەفۆنمان بۆ کرد، ئەویش هات، تاکو ژیانی کوڕەکەت لە مردن ڕزگار بکات، ئیستاش بۆیە زوو ڕۆیشت، تاکو بە ناشتنی کوڕەکەی ڕابگات!!!!!!!

باوکی کوڕەکە، دەستی بە گریان کرد وفرمێسک لە چاوانی هاتە خوارەوە وگوتی خوایە گیان: من چ بێڕێزییەکم کرد بەرامبەر ئەو پیاوە گەورە و خۆڕاگرە؟!!!!!

خوایە گیان: وەک ئەو دکتۆرە بروادارە، فێرە ئارامگرتن و لێبوردەییمان بکە، کە لە کاتی تەنگانە و ناخۆشی و نەخۆشیدا، خۆڕاگر و ئارمگر و دانبەخۆداگر بین!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- کلیلی چارەسەرکردنی نەخۆشی و نەخۆشییەکان، تەنیا ئارامگرتن و خۆڕاگرتنە، چونکە هیچ گرێکوێرەیەك بە توورەیی و هەستبریندارکردن چارەسەر نابێت، بگرە ئالۆزتر دەبێت.
- نابێ هیچ شتێك ببێتە ڕێگر، لەوەی هاوکاری خەڵکی هەژار و نەدار و نەخۆش و لێقەوماو بکەین.
- مرۆڤی مەزن لە دۆخە سەخت و دژوارەکاندا دەناسرێتەوە.
- بەهێزی و گەورەیی بە بەخشینە، بە توورەیی و خۆسەغڵەت کردن نییە.

## چیرۆکی

## (٩٠)

## ئیشائەڵلای ناوێ!!!

ڕۆژێـك، پیـاوێکی لـەخۆبایی دەچێتـە بـازاڕ، لـە ڕێ، خـەڵکی ئـاوایی لێـی دەپرسن: بۆ کوێ دەچیت؟

ئەویش دەڵێ: دەچم بۆ بازاڕ، گوێدرێژێك بکرم!!!

ئـەو خەڵکـەش پێـی دەڵـێن: بڵـێ (ئیشـائەڵڵا)، ئـەویش دەڵـێ: (ئیشـائەڵڵای ناوێ)، گیرفانم پڕ لە پارەیە، بازاڕیش پڕ لە گوێدرێژە، ئیتر (ئیشـائەڵڵا)ی بۆچییە؟!!!!!!

کابرا گەیشتە بازاڕ، بەڵام لەناکاو دزێکی لـێ پەیدا بـوو، هەر هێنـدەی زانـی پارەکەی نەماوە و لێی دزراوە!!!

بە دڵێکی شکاو و دەستێکی بەتاڵەوە گەڕایەوە ماڵەوە!

خەڵکی ئاوایی لە ڕێ دیتییان، پێیان گوت: ها کاکە لە کوێوە دێیت؟

ئەویش گوتی: ئیشائەڵڵا لە بازاڕ دێمەوە!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ هەر چەند بەهێزیش بێت، هێز و تواناکانی سنووردارە، بۆیە هەمیشە پێویستی بە سۆز و بەزەیی و دلۆڤانی خوای میهرەبان هەیە، چونکە مردن و ژینمان بەدەست خودایە.
- نابێ مرۆڤ بە پارە و پووڵ لەخۆبایی ببێت.
- زۆرجار کەوتن، وا دەکات کە مرۆڤ بەخۆیدا بچێتەوە و پەند لە ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ژیان وەربگرێت.
- ........................................................
- ........................................................
- ........................................................

## چیرۆکی

## (٩١)

## گەورەترین زانا و گەورەترین دز

دزێـك بـە شـەو، بەمەبەسـتی دزیـکـردن، خـۆی کـرد بـە مـاڵی زانـای پایەبەرز(ماڵکی کوڕی دینـار)دا، زۆر گـەڕا، هیچی دەسـتنەکەوت، سـەیری کرد وا پێشەوا ماڵك خەریکی نوێژکردنە، کە نوێژەکـەی تـەواوکرد، چاوی بە دزەکـەی کـەوت و پێـی گـوت: هیچـی دونیـات دەسـتنەکەوت، ئایـا دەتـەوێ هیچی قیامەتت دەستکەوێت؟!!!

دزەکە، لەگەڵ ئەوەی کە حەپەسابوو! بە چاوی پڕ لـە فرمێسکەوە، هاتـە خزمەتی و دانیشت!!!

دوای ئامۆژگـاریکردنی، دڵـی دزەکـە نـەرم بـوو، بۆیـە لەسـەر دەسـتی ئـەو زانایـە تەویـەی کـرد و پێکـەوە چوونـە مزگـەوت، بـۆ ئەنجامـدانی نـوێژی بەیانی!!!

نوێژخوێنەکان، کە بینییان وا گەورەترین زانا و گـەورەترین دز پێکـەوە لـە مزگەوتن، سەریان سوڕما!!!!

بۆیە لە پێشەوا ماڵکیان پرسی: هۆی ئەمە چییە ؟!!!!

گوتی: ئەم کابرایە هاتبوو دزیمان لێبکات، بەڵام ئێمـە دڵـی ئـەومان دزی و هێنامانە ئێرە!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نەرم و نیانی و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی چاك، کاریگەرییەکی ئەرێنی لەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤ جێدێڵێت، بۆیە گوتراوە: مار بە قسەی خۆش لە کونێ دێتە دەرێ.
- زۆرجار هەڵەیەك، دەبێتە هۆکارێك بۆ خۆڕاستکردنەوە و بەخۆداچوونەوە.
- نابێ مرۆڤ لە ژیاندا، بێ هیوا و بێ ئومێد بێت و دەستبەرداری کاری خێر بێت.
- دەبێ مرۆڤ لە ژیاندا هەم چاکەکار بێت، هەمیش چاکەخواز، واتە، هەم بۆ خۆی بژیت، هەمیش بۆ خەڵك.
- هەڵە بە هەڵە ڕاست ناکرێتەوە، ئەگەر زاناکە، دزەکەی دەربکردبایە دەرەوە، ئەوا لەسەر دزیکردنەکەی بەردەوام دەبوو و ڕێی نەدەکەوتە مزگەوت!!!!!
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (٩٢)

## متمانە بەخۆبوون

کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، لە بەشی فڕۆکەوانی، بۆ گەشتێك بانگهێشت کرابوون، کاتێ سواری فڕۆکەکە بوون، دەرگاکانی هاتنە داخستن، بەڵام پێش ئەوەی دەست بە فڕین بکات، مامۆستاکان لەلایەن تیمی فڕۆکەوانییەوە ئاگادارکرانەوە، کەوا ئەم فڕۆکەیە لەلایەن قوتابییەکانی ئەوانەوە دروست کراوە، گشت مامۆستایان هەستانە سەر پێ و هەوڵیاندا لە فڕۆکەکە بێنە خوارەوە، تەنیا یەك مامۆستا نەبێت، کە لێیان پرسی بۆچی هێندە متمانەت بە قوتابییەکانت هەیە و لە شوێنی خۆت نەجووڵایت؟!!!

گوتی: چونکە پەروەردەی دەستی خۆمن!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- متمانە بەخۆبوون، بەردی بناغەی سەرکەوتنە.
- مرۆڤ چی بچێنێت، ئەوە دەچنێتەوە.
- ئەگەر مامۆستا لە کارەکانیدا دڵسۆز و ڕاست و پسپۆر بێت، متمانەیەکی زۆر بە خۆی و کارەکانی دەبێت و لە هیچ شتێك ناترسێت.
- مامۆستای فێڵباز و چەواشەکار، نە متمانەی بە خۆی هەیە، نەبە قوتابییەکانیشی.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (٩٣)

## وانەی ئارامگرتن

فـوزەیلی کـوڕی عـەیاز دەڵـێ: لـە منـداڵێکی بچکۆڵـەوە فێـری وانـەی ئارامگرتن بووم.

فوزەیـل، ئـاوا بەسـەرهاتی خـۆی و ئـەو منداڵـە دەگێڕێتـەوە: (جارێـك دەچوومە مزگەوتێ، لە ڕێ، ژنێکم بینی، لە منداڵە بچکۆلانەکەی دەدا!! منداڵەکـە خـۆی گەیانـدە دەرگـا و دەرگـای کـردەوە و لـە دەسـتی دایکـی هەڵهات!! دایکی دەرگای بە ڕوویدا داخست!! منداڵەکە بەگریانەوە هاتە کۆڵان و سەیری ئەملا و ئەولای کرد، هیچ شوێنێك و کەسێکی شك نەبرد کە داڵدەی بدات!! بۆیـە هێدی گەڕایـەوە ماڵـەوە، بـەڵام دایکی، دەرگـای بەڕوویدا داخستبوو!!!!

بۆیـە لـە پێش دەرگـای ماڵەکەیان ڕاکشا و سـەری خسـتە سـەر شانی و خەوی لێکەوت!!!!

کاتێ دایکی، ئاوا منداڵەکەی بینی، هاتە دەرەوە و دڵی بۆی سووتا و لە باوەشـی گـرت و بردییـەوە ژوورەوە و پێـی گـوت: کـوڕی شـیرینم، بـۆچی بـە گوێم ناکەیت و بێ فەرمانیم دەکەیت ؟!!!!!

کاتێ فوزەیل ئەم بەسەرهاتەی دەگێڕایەوە، تنۆك تنۆك فرمێسك لە چاوەکانی دەهاتنە خوارەوە و دەی گوت: سبحانە اللە، ئەگەر بەندەکانی خوا بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەوا هەمیشە دەرگای سۆز و ڕەحمەتی خوای دلۆڤان بەڕوویاندا کراوەیە و دەرگایان لێ دەکاتەوە!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- دەرگای قابی خودا، هەمیشە بۆ بەندە گوناهکارەکانی کراوەیە، بۆیە هەر کاتێ مرۆڤ تەوبە لە گوناهەکانی بکات و بگەڕێتەوە لای ئەو، عەفوّی دەکات و لێی دەبۆرێت.
- هیچ باوەشێك لە باوەشی دایك گەرمتر نییە، بۆیە منداڵ حەز دەکات لە باوەشی دایکیدا گەورە ببێت.
- هەموو مرۆڤێك هەڵە و تاوان دەکات، بەلاّم باشترین هەڵەکار، ئەو کەسەیە کە تەوبە لە هەڵەکانی دەکات.
- مرۆڤی ژیر دەبێ پەند لە ڕووداو و پێشهاتەکانی ژیان وەربگرێت.
- ................................................
- ................................................
- ................................................

## چیرۆکی

## (٩٤)

## بابە تۆ دەستم بگرە

دەگێڕنـەوە، پیـاوێکی پیـر لەگـەڵ کچـە بچکۆلانەکـەی لـە پردێـك دەپەڕینـەوە، باوکەکـە دەترسا کچەکـەی لـە پردەکـە بکەوێتـە خـوارەوە، بۆیـە ڕووی لە کچکەی کرد و گوتی: کچم دەستم بگرە، با نەکەوی!!

کچەکەی بێ سێ و دوو..گوتی: نا بابەگیان، تۆ دەستم بگرە!!!

باوکەکە گوتی: بۆچی کچم، مەگەر چ جیاوازییەکی هەیە، تۆ دەستم بگری، یا من دەستت بگرم؟!!!

کچکە گوتی: بابەگیان جیاوازییەکە زۆرە، ئەگەر من دەستت بگرم، ڕەنگە دەستت بەردەم و بکەومە ناو ئاوەکەوە، بەڵام دڵنیام ئەگەر تۆ دەستم بگریت، هەرگیز دەستم بەرنادەیت و ناهێلیت بکەومـە نـاو ئاوەکـەوە، ئەمەیـە جیاوازی نێوان من و تۆ!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- باوك بۆ منداڵ، وەك قەڵا وایە، تا ئەوپەڕی توانا، هەوڵ دەدات منداڵی خۆی لە شتە زیانبەخشەکان بپارێزێت.
- هێندەی منداڵ متمانەی بە باوکی هەیە، هێندە بە خۆی نییە، چونکە دەزانێ باوکی لە هیچ بارودۆخێکدا دەستبەرداری نابێت.
- باوکی دڵسۆز و بەرپرسیار، هەمیشە وریا و وشیار و بێدار و چاوکراوەیە و لە کاتی مەترسیدا، بەرگری لە منداڵەکانی دەکات.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

# چیرۆکی
## (٩٥)
## مافی دایک

پیاوێکی لە خواترس و بڕوادار، دایکێکی پەککەوتەی هەبوو، دایکەکەی بەهۆی پیری، لەسەرجێ کەوتبوو، ئەو پیاوە لەگەڵ دایکی زۆر نەرم و نیان و چاك بوو، زۆر بەجوانی چاودێری دایکی دەکرد و بەباشترین شێوە بەخێوی دەکرد، تەنانەت خواردنیشی پێ دەدا و لە میز و پیسایی پاکی دەکردەوە!!

ڕۆژێك لە پیاوچاکێکی پرسی: زۆر خزمەتی دایکم دەکەم، تەنانەت خواردنیشی دەدەمێ و لە کۆڵیشم دەکەم و پاکیشی دەکەوە، ئایا توانیومە مافی ئەو بدەمەوە؟!!!!

پیاوچاکەکە گوتی: نەك هەر نەتتوانیوە مافی دایکت بدەیتەوە، تەنانەت نەتتوانیوە مافی یەك ژانی ئەویش بدەیتەوە کە لە کاتی لە دایکبوونتا کێشاویەتی!!!!!

دەزانی بوو؟ چونکە تۆ دایکت بەخێو دەکەی بەهیوای ئەوەی ڕۆژێك زووتر لە کۆڵت بێتەوە و بمرێت!!! بەڵام ئەو تۆی بەخێوکردووە، بەهیوای ئەوەی کە تەمەنێکی دوور و درێژ بژیت!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- کەس ناتوانێ قەرزی دایك بداتەوە، تەنانەت ئەگەر هەموو دونیاش موڵکی ئەو بێت.
- چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك، پێش ئەوەی فەزیلەت بێت، ئەرك و بەرپرسیارەتییە.
- دڵسۆزی و فیداکاری دایك، لەگەڵ دڵسۆزی و فیداکاری منداڵ بەراورد ناکرێت، چونکە وەك بەراوردکردنی زێڕ و تەنەکە وایە!!!!
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی
## (٩٦)
## حاجی سابیر

کابرایەک ناوی سابیر بوو، ڕۆیشتبوو حەج!!!

مەراسیمی حەج تەواو بوو، هاتەوە، چووە دوکانەکەی لای ماڵی خۆیان و بە خاوەنی دوکانەکەی گوت: ئادەی دەفتەری قەرزەکانم دەربێنە و ناوی من ببینەوە! دوکانداریش خەنی بوو!!!!

لە دڵی خۆیدا گوتی: بەخوا مام سابیر چوویتە حەجێ، دیارە دڵی نەرم بووە و قەرزەکانی دەداتەوە!!!!

سابیر گوتی: ناوی منت دیتەوە ؟

کابرا گوتی: بەلێ مام سابیر .

مام سابیر گوتی: ئا دەی، لە پێش ناوەکەم بنووسە(حاجی)، با ببێتە حاجی سابیر!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤی دووڕوو، شەرمەزاری دونیا و قیامەتە!!!
- مرۆڤی دیندار، نابێ بە ناوی دینەوە، دونیا بخوات.
- نابێ دیداری بۆ خۆ هەڵکێشان بێت!!!
- هەڵخەڵەتاندنی خەڵك بەناوی حەجەوە، گەورەترین ناپاکییە!!!!!
- ..........................................
- ..........................................
- ..........................................

## چیرۆکی
## (٩٧)
## پیری و هەزار عەیب

لە پیاوێکی پیریان پرسی:
دوای (٧٠)ساڵ لە هاوسەرگیریی، بۆچی هێشتا
بە هاوسەرەکەت دەڵێی "چاوەکەم، دڵەکەم، گیانەکەم ؟!!!!
گوتی: وەڵڵا ناوی هاوسەری خۆم بیرچۆتەوە!!
ناشوێرم لێی بپرسم ناوت چییە!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ کە چوو تەمەنەوە، زیاتر پێویستی بە ڕێزگرتن و خۆشەویستی هەیە.
- خۆشەویستی نێوان ژن و پیاو، پەیوەست نییە بە تەمەنی گەنجێتییەوە، بەڵکو پێویستە تا مردن بەردەوام بێت، چونکە ژیان بەبێ خۆشەویستی هیچ واتایەکی نییە.
- دڵشکاندن، هونەر نییە، هونەر ئەوەیە بچیتە ناو دڵەکانەوە، نەك دڵەکان بشکێنیت!!!!
- هاوسەرگیریی لەسەر بناغەی خۆشەویستی دامەزراوە.
- ..............................................

# چیرۆکی

## (٩٨)

## دوو زمانی

پیاوێک هاتە لای حەسەنی بەصری و گوتی: قوربان پیاوێک جوێنی پێدایت!!

حەسەنی بەصری وەڵامێکی زۆر جوانی دایەوە و فەرمووی:

ئەو پیاوە تیرێکی بۆ هاوێشتم، پێم نەگەیشت، تۆ بۆ هەڵی دەگریتەوە و لێم دەدەیت؟!!!!!!!!!

ئایا شەیتان کەسی نەدۆزییەوە بیکاتە قاسیدی خۆی، تۆ نەبێت؟!!!!

کاکە گیان تەوبە بکە و پەشێمان بەرەوە لە گێڕانەوەی قسەی خەڵک بۆ خەڵک.......

کابرا سەری شۆڕکرد و ڕۆیشت!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤی دوو زمان و دووڕوو، هەمیشە شەرمەزارە، چونکە قسەی ئەم بۆ ئەو دەبات، قسەی ئەویش بۆ ئەم دەبات، بۆیە پیرەمێردی شاعیری گوتوویەتی: (قسەی هەق دەگمەن دەگاتە جێی خۆی، وتەی بەد زۆر

کەس پۆستەچییە بۆی). هەروەها دەڵێ:(کێ قسەی خەڵکی کرد بە لاتەوە، بۆ ئەوان قسەی تۆش دەباتەوە).

- نابێ مرۆڤی ژیر ڕێ بە کەسانی دوو زمان بدات، کە لای ئەو غەیبەتی ئەم و ئەو بکات، چونکە قسەی ئەویش بۆ ئەوانی دیکە دەباتە و تۆوی بوغز و قین لە ناو دڵەکاندا دەڕوێنێت.
- ڕێگرتن لە کاری خراپ، جۆرێکە لە چاکەکاری، چونکە ئەگەر کەس نەبێت ڕێ لە خراپە بگرێت، کەی خراپە کۆتایی دێت؟!!!
- نابێ مرۆڤ پردەکان بڕۆخێنێت، بەڵکو دەبێت ببێتە پرد بۆ بە یەك گەیاندنی لایەنە ناکۆکەکان....
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی
## (٩٩)
## وەفاداری

پیاوێکی زۆر هەژار لەگەڵ خێزانەکەی دەژیا، لە شەوێکدا ئافرەتەکە داوای لە پیاوەکە کرد شانەیەکی بۆ بکڕێت، چونکە قژی زۆر درێژ بوو بوو، ئارەزووی دەکرد بەجوانی بیهێڵێتەوە!!

پیاوەکە سەیرێکی کرد و لە چاوانی نیگایەکی خەمبارانە دەبینرا و پێی گوت: ناتوانم بۆت بکڕم.

تەنانەت کاتژمێرەکەشم پێویستی بە قایشێکە، بەڵام توانام نییە بیکڕم ..

ژنەکە هیچ دەمەقاڵەیەکی لەگەڵ پیاوەکە نەکرد، تەنیا زەردەخەیەکی بەڕوویدا کرد !!

لە ڕۆژی دواتر و دوای ئەوەی پیاوەکە لەکارەکەی خۆی بووبووەوە، ڕووی کردە بازاڕ و کاتژمێرەکەی بەنرخێکی هەرزان فرۆشت، بەو پارەیە شانەیەکی بۆ خێزانەکەی کڕی....

لەکاتی ئێوارە، کە گەڕایەوە ماڵەوە، شانەکەی بەدەست گرتبوو، بەڵام بینی قژی خێزانەکەی زۆر کورت بۆتەوە!!!!

بەڵام لە دەستی خێزانەکەی قایشێکی کاتژمێری بینی!!!

لێرەدا هەردووکیان سەیری یەکتریان کرد و چاویان پڕبوو لە گریان!!! نەک لەبەر ئەوەی کە ئاواتیـــان نەهاتـــە دی، بەڵکـــو لەبەر ئەوەی هەردووکیـان بەهەمـان ئەنـدازە یەکتریـان خۆشدەویسـت .. هەردووکیشـیان مەبەستیان بوو ئارەزووی ئەوی دیکە جێبەجێ بکات...

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- ڤیان و خۆشەویستی هەوێنی بەختەوەرییە، ئەگەر خۆشەویستی لە نێوان ژن و پیـاودا نـەبێت، ژیانیـان دەبێتـە ژان، هـەر چەنـدە پـارە و پـووڵ و دینار و دۆلار و کۆشك و تەلاریشیان هەبێت.
- پێویستە ژن و پیاو هەوڵدەن داواکاری یـەکتری جێبـەجێ بکـەن، چونکـە ئەمە نیشانەی ئەومیەگرنگی بە یەکتری دەدەن.
- نابێ هەژاری ببێتە تێکدانی هێلانەی خۆشەویستی.
- ڕێکپۆشـی و خۆڕازاندنـەوەی ژن بـۆ پیـاو و پیـاو بـۆ ژن، نـەك هـەر کارێکی باشە، بگرە پێویستیشە، چونکە دەبێتە مایەی خۆشەویستی و یەکتر خۆشویستن.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

(١٠٠)

## چاکە ون نابێت

شــۆفێرێکی ژن، لە نیــوەی ڕێگــادا ئۆتۆمبێلەکــەی لەکــارکەوت. گەنجێکیش بەوێدا هات، ویستی یارمەتیی ژنەکە بدات!!!!

بەڵام ژنەکە دەترسا، چـونکە کـوڕەکە، شـێوەی لە کەسـێکی هەژار دەچـوو، نیگـەران بـوو لەوەی زیـانی پێبگەیەنێـت، بەڵام ناچـاربوو، هاوکارییەکـەی قبـووڵ بکـات، چـونکە هـیچ بژاردەیـەکـی دیـکەی نـەبوو!!!!!!!

گەنـجەکە داوای لە ژنەکە کـرد لە نـاو ئۆتۆمبێلەکەیـدا بمێنـتەوە، چونکە کەش و هەوا زۆر سارد بوو...

خۆی چووە ژێر ئۆتـۆمبێلەکە و مـاوەیەك خەریکی ئۆتـۆمبێلەکە بوو، دواتــر زەردەخەنەیەکــی کــرد و داوای لە ژنەکە کــرد، کــە ئــیش بــە ئۆتۆمبێلەکەی بکات...

ژنەکە سویچەکەی دەرهێنا و سوڵفێکی لێدا، ئۆتۆمبێلەکەی کەوتەوە کار و ئیشی کرد!!!

ژنەکە بە گەنجەکەی گوت: چەند پارەت دەوێ لە بەرانبەر چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکەم، چونکە تۆ چاکەیەکی گەورەت لەگەڵ کردم؟!!!

گەنجەکەش زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: خاتوون، من ناوم (ئادەم)ە، هیچ پارەم لێت ناوێ، ئەوەی دەمەوێ ئەوەیە، هاوکاریی هەرکەسێك بکەی کە پێویستی بەیارمەتی تۆ هەیە.

ژنەکەش ڕێگەی گرتەبەر، دوای ماوەیەك، لە چێشتخانەیەك لایدا، هەتا پشوویەك بدا، لە چێشتخانەکەدا، شاگردێکی ژنی (سکپڕ)ی بینی، وێڕای ئازار و گەورەیی سکی، بەڵام کاری دەکرد..

شاگردەکە دەستەسڕێکی وشکی هێنا بۆ ژنەکە، هەتا قژی وشك بکاتەوە، لە بەرانبەردا، ژنەکەش ١٠٠ دۆلاری دایە دەست ژنە شاگردەکە...

شاگردەکەش خێرا ڕۆیشت، هەتا باقییەکەی بۆ بهێنێتەوە!!! بەڵام لەکاتی گەڕانەوەیدا، ژنەکەی لەسەر مێزەکە نەبینی، تەنیا نامەیەکی بینی لەسەر مێزەکەی نووسرابوو: ٥٠٠ دۆلاری دیکەم لە ژێر مێزەکەدا بۆ داناویت!!!!

شاگردەکەش بەبینینی ئەو بڕە پارەیە زۆر دڵخۆش بوو وگەڕایەوەماڵەوە، بیری لەوە دەکردەوە کە خۆی و مێردەکەی چەندە پێویستییان بەو بڕە پارەیە هەیە، چونکە مانگی داهاتوو دەبوونە خاوەن منداڵ و ئەو پارەیە بۆ خەرجی منداڵەکەیان بڕێکی باش بوو..

کاتێك گەیشتە ماڵەوە ،پێش ئەوەی باسی پارە و ئەو ژنەی بۆ بکات، مێردەکەی لە ئامێز گرت و گوتی: "ئادەم خۆشم دەوێی"، واتە، مێردی ئەو ژنە سکپڕە، هەمان ئەو پیاوە بوو،کە ئۆتۆمبێلی ئەو ژنە شۆفێرەی چاککردبووە.....

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- چاکە ون نابێ، بۆیە گوتراوە، چاکە بیکە و بیدە بە ئاوا، با خەڵك نەیزانێ، لای خوا نووسراوە.
- هەر کەسێك پێویستی بە هاوکاری ئێمە هەبوو، دەبێ بەپیریەوە بچین و لە تەنگانە ڕزگاری کەین.
- خۆشکردنی دڵی نەخۆشێك، یان هەژارێك، یان بێنەوا و سێوی و بێ باوکێك، هەم ئەرکە، هەمیش خێر و پاداشتێکی زۆری هەیە و دەبێتە مایەی ئاسوودەیی و بەختەوەری لە دونیا و قیامەت.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

(١٠١)

## لێبوردەیی

دوای دوو ساڵ لە پێکەوە ژیان، نیوەڕۆیەک، خێزانەکەی چێشتەکەی لە دەست دەسووتێ! بۆیە هەست بە شەرمەزاری دەکات بەرامبەر پیاوەکەی، چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکات، ئاخۆ دەبێت چ کاردانەوەیەکی هەبێت!!

کاتێ پیاوەکەی دەزانێت چێشتی هاوسەری سووتاوە!!!

هەڵدەستێت نێوچاوانی خێزان و هاوسەر و هاوسۆزی ژیانی خۆی ماچ دەکات و لە ئامێزی دەگرێت و پێی دەڵێ: بەم چێشتە سووتاوە خۆشترین کات و ساتەکانی تەمەنم بیرهاتەوە!!

خێزانەکەی گوتی: کامە رۆژ، خۆشترین کات و ساتەکانی تەمەنت بوو؟

پیاوەکە گوتی: بیرتە بۆ یەکەم جار، دوای ئەوەی ماڵی باوکت جێهێشت و هاتیە لای من ،چێشتت ئامادەکرد، ئەوکات کابانێکی شارەزا نەبویت، چێشتەکەت سووتا... ئەو رۆژە خۆشترین کاتی تەمەنم بوو، کە ماوەیەکی کەم بوو تۆم وەک هاوسەری ژیانم هەڵبژارد وگەیشتم بە هەموو هیوا و ئاوات و ئومێدەکانی ژیانم.

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- لێبوردەیی کلیلی چارەسەرکردنی کێشەکانە، بۆیە نابێ مرۆڤ بیر لە تۆڵەکردنەوە بکاتەوە، چونکە مرۆڤ بە لێبوردن گەورەتر دەبێ.
- ژیانی دونیا تەنیا بریتی نییە لە کەیف و سەما، بەڵکو پڕە لە خۆشی و ناخۆشی و هەوراز و نشێو و شینی و شادی، بۆیە هەبوونی هەندێ ناخۆشی لە ژیاندا کارێکی ئاساییە، چونکە ئەمە سروشتیی ژیانە، هەر وەك چۆن ساردی و گەرمی هەیە، ڕووناکی و تاریکی هەیە، هەڵبەز و دابەز هەیە، ژیان و مردن هەیە، ئاوا خۆشی و ناخۆشیش هەیە.
- هونەر ئەوە نییە کێشە دروست کەیت، هونەر ئەوەیە کێشە چارەسەر کەیت.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (١٠٢)

## زیرەکی بە شەهادە نییە

خـاوەنی کۆمپانیایـەکی سـابون، کێشـەیـەکی توشـبوو، خـەریك بـوو کۆمپانیاکـەی، متمانـەی کڕیارەکـانی لـە دەست بدات و دووچاری زیـانێکی ماددی گەورە ببێت.

کێشـەکەی دەگەڕایـەوە بـۆ هەنـدێك لـەو کارتۆنـە سـابونانەی کـە بەرهـەم دەهـاتن، بـەڵام بـە بـەتاڵی، ئـەویش بـەهۆی خێرایـی ئـەو مـەکینـەی کـە سابونەکانی دەخستنە ناو کارتۆنەکانەوە!!!!

بۆیە خاوەن کارگەکە داوای لە شارەزایان کرد، تا چارەیەك بدۆزنەوە..، ئەوانیش گوتیان: تاکە چارەسەر ئەوەیە کە ئامێرێکی لیزەری بهێنی، لەسەر هێڵی تێپەڕبوونی سابونەکان دابنێیت، تاکو پشـکنین بۆ هـەموو کارتۆنـەکان بکات، کە ئاخۆ سابونی لە ناوە، یاخود بەتاڵە. بەڵام نرخی ئەم ئامێرە ٢٠٠ هەزار دۆلاری ئەمریکییە، خاوەن کارگەکە، کە گوێی لەو نرخە بـەرزە بـوو، تووڕەبوو، چونکە نرخەکەی پێ زۆر بوو، بەڵام پاش بیرکردنەوەیـەکی قـووڵ، بڕیاریدا کە ئەم ئامێرە بکڕێت، تـا کۆمپانیاکـەی متمانـەی خۆی لـە دەست نەدات و مایەپووچ نەبێت!!!!

هەر لە نوسینگەکەی خۆی بوو، کرێکارێکی گەنج هاتە ژوورە و پێی گوت: ١٠٠دۆلارم بدەرێ، ئەو کێشەیەت بۆ چارەسەر دەکەم!!!

خاوەن کارگەکە، سەری سوڕما لەم چارەسەرە خێرا و هەرزانە، بۆیە ئەو برە پارەیەی بە کرێکارەکە دا.

بەیانی کرێکارە گەنجەکە پانکەیەکی لەسەر هێڵی تێپەربوونی کارتۆنەکانی سابونەکان جێگیرکرد....

بەمەش هەرچی کارتۆنی بەتاڵ هەبوایە، بەهۆی تەوژمی هەوای پانکەکەوە دەفڕی و لە سەر هێڵەکە نەدەما، بەمەش کێشەکە چارە بوو و کارگەکە گەڕایەوە دۆخی جارانی..!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- زیرەکی بە شەهادە نییە، بە بیرکردنەوە و هۆشمەندییە.
- بە چاوێکی کەم سەیری کەس مەکە، چونکە هەر کەسێك، خوا بەهرەیەکی پێ بەخشیوە، ئەگەر ئەو بەهرەیە بیدۆزێتەوە و بەباشی بەکاری بێنێت، دەشێ لە کایەکانی ژیاندا شوێن پەنجەی دیار بێت.
- پرس و ڕاوێژکردن لە کاتی سەرهەڵدانی کێشەکان، زۆر پێویست و گرنگە، چونکە چەند عەقڵێك، لە عەقڵێك باشتر کار دەکەن.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

(١٠٣)

## هەستی پیرەمێردێک

لە پیرەمێردێکیان پرسی: کام ژن وەفا و ئیخلاسی زیاترە بۆ مێردەکەی، پرچ زەرد، یان پرچ ڕەش، یان پرچ سوور؟!!!!!

پیرەمێردەکە زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: زۆربەی ئەو ژنانەی کە وەفایان بۆ مێردەکانیان هەیە، پرچ سپییەکانن!!!!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە**

- وەفا پەیوەست نییە بە تەمەنەوە، پەیوەستە بە ناخ و ویژدانەوە.
- درەختی هاوسەری، بە ئاوی وەفا نەبێت، ناڕوێت.
- ڕێزگرتن لە پیرەکان، هەم ئەرکە، هەمیش فەزیلەتە.
- مرۆڤ لە تەمەنی پیری، زیاتری پێویستی بە چاودێری و هاوکاری ئەوانی دیکە هەیە.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (١٠٤)

## وانەیەک لە سروشتەوە

ڕۆژێکیان، کوڕێك و باوکێك لەسەر چیایەك پیاسەیان دەکرد.

لەناکاو کوڕەکە کەوت بە زەیدا و ئازارێکی زۆری پێگەیشت و هاواری کرد ئائائا هـ هـ هـ!!!

بەسەرسوڕمانێکەوە، دەنگەکەی خۆی بیستەوە لەناو چیایەکە: ئائائاهـ هـ هـ!!!

کوڕەکە زۆر بە پەرۆش بوو، بۆ ئەوەی بزانێت ئەو دەنگە دەنگی کێیە، بۆیە بانگی کرد(تۆ کێیت)؟

ئەوەبوو هەمان وەڵامی لە چیایەکە بیستەوە و گوتی (تۆ کێیت)؟

ئینجا کوڕەکە هاواری کرد بەرەو چیایەکە و گوتی(من سەرم لێت سوڕدەمێنێ)؟!!!!

دەنگەکەش وەڵامی دایەوە(من سەرم لێت سوڕدەمێنێ)!!

کوڕەکەش لەو وەڵامە زۆر تووڕە بوو، هاواری کرد (ئەی ترسنۆك)!!!!!!

ئەوەبوو بە هەمان شێوە وەڵام درایەوە(ئەی ترسنۆك)!!!

کوڕەکەش سەیرێکی باوکی کرد و لێی پرسی: ئەمە چییە ڕوودەدات؟!!!!

باوکیشی بە زەردەخەنەیەکە گوتی: کوڕم گوێبگرە:

ئینجا باوکەکە گوتی: تۆ پاڵەوانیت!!!!

دەنگەکە وەڵامی دایەوە: تۆ پاڵەوانیت!!!!!

کوڕەکە زۆر سەری سوڕما، بەڵام هیچی لێ تێنەگەیشت!!!!

ئینجا باوکەکە دەستی کرد بە ڕوونکردنەوەی بابەتەکە و گوتی:

خەڵکی بەمە دەڵێن دەنگدانەوە، لە ڕاستیدا ئەوە ژیانە، ژیان....

ژیان هەر ئەوەت دەداتەوە کە تۆ لەم ژیانەدا دەیڵێیت یان دەیکەیت، بە کورتی و کوردی، ژیانمان ڕەنگدانەوەی کارەکانمانە!!!!!!!!

گەر تۆ خۆشەویستی زیاترت دەوێ لەم ژیانەدا، ئەوا خۆشەویستی زیاتر لە دڵتدا دروست بکە، گەر تۆ هێز و وزەیەکی زیاترت دەوێت لە تیمەکەتدا، پێش هەموو کەسێك هێز و توانای خۆت زیاد بکە، ئەم پەیوەندییە دەکرێت بکرێتە پێوەر بۆ هەموو لایەنەکانی ژیان

ژیان هەر ئەوەت دەداتەوە کە تۆ پێت داوە، ژیان ڕێکەوت نییە، ژیان ڕەنگدانەوەی تۆیە، تۆ!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ لە ژیاندا چی بچێنێت هەر ئەوە دەدورێتەوە.
- بۆ هەر گۆڕانکارییەك، کە مرۆڤ گەرەکی بێت لە ژیاندا بێنێتە ئاراوە، پێویستە لە خۆیەوە دەستپێبکات.
- تا مرۆڤ نەیبەخشێت، وەری ناگرێت، جا بۆ ئەوەی شتێك بستێنین، دەبێ شتێك ببەخشین.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١٠٥)

## مەرجی مارە برین

کوڕێك چوو بۆ داوای کچێک،کاتێک کچەکە حاڵی کوڕەکەی زانی، گوتی: بە مەرجێک شووت پێ دەکەم، کە دایکت بۆ ئاهەنگی مارەبڕین نەیەت!! کوڕەکە زۆر پەشۆکا و نەی دەزانی چی بکات، بۆیە بیری کردەوە کە ڕاوێژ بە هاوڕێیەکی بکات، کە زۆر خۆشی دەویست و متمانەی پێ بوو. کاتێک بە هاوڕێکەی گوت، هاوڕێکەی گوتی:بۆ ئەم مەرجەی داناوە؟! کوڕەکە بە شەرمەوە وەڵامی دایەوە و گوتی:کاتێک تەمەنم(١)ساڵ بوو، باوکم مرد، ئیتر دایکم بەخێوی کردم، بۆیە ناچار بوو جل و بەرگی خەڵکی بشوات، تا ئێمەی پێ بەخێو بکات، بۆیە من زۆر شەرم دەکەم لەو کارەی کە دایکم دەیکات و دەمەوێت ژیانێکی تازە دروست بکەم. هاوڕێکەی گوتی: تەنیا داوایەکم هەیە لێت، بڕۆ دەستی دایکت بشۆ، ئینجا سبەینێ وەرەوە وەڵامی خۆمت پێ دەڵێم!! بۆیە کە کوڕەکە گەڕایەوە، خێرا بانگی دایکی کرد و گوتی: دەمەوێت دەستت بشۆم،کاتێک دەستی دایکی دەشۆرد، بینی دەستەکانی دایکی چرچ بووە و هەمووی برین و زامە، لەو کاتە کوڕەکە دەستی کرد بە گریان و هەردوو دەستی دایکی تێر ماچ کرد!!! هەر لەو کاتە خۆی پی نەگیرا تا

سبەینێ چاوەڕی بکات و بڕواتەوە بۆ لای هاوڕێکەی، بۆیە خێرا تەلەفۆنی بۆ هاوڕێکەی کرد و گوتی: زۆر سوپاست دەکەم هاوڕێکەم، هەرگیز دایکم ناکەم بە قوربانی کچی خەڵک، لە کاتێکدا دایکم خۆی کردە قوربانی بۆ ئێستای من و بەختەوەریم، چونکە ئەوەی ڕێزی دایکی نەگرێت لە ژیانیدا، ئەوە کەس ڕێزی ناگرێ!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- کەس ناتوانێ قەرزی دایك بداتەوە.
- هاوڕێ لە ژیانی مرۆڤدا ڕۆڵێکی زۆر کاریگەری هەیە، جا ئەگەر هاوڕێکانمان باش بوون، ئەوا دەبنە مایەی خێر و خۆشی، بەڵام ئەگەر خراپ بوون، دەبنە مایەی نەهامەتی و نەگبەتی، بۆیە دەڵێن: هاوڕێ وەك مەسعەد وایە، یان بەرزت دەکاتەوە یان نزمت دەکاتەوە.
- ڕاوێژکردن بە کەسانی ژیر و هۆشمەند، کارێکی زۆر پێویست و گرنگە؛ چونکە دەڵێن: هەر سەرێك عەقڵێکە!!!
- نابێ مرۆڤ هیچ کاتێ نزیکترین کەسی خۆی، کە دایکیەتی، بکاتە قوربانی کچی خەڵك!!!!
- دەبێ مرۆڤ بەوەفا و بە ئەمەك بێت و چاکەی چاکەکاران لەبیر نەکات.
- نابێ کوڕ یان کچ بە مەرجێك ڕازی بێت، کە ببێتە هۆی لێکترازانی خێزانی!!!!!

## چیرۆکی

(١٠٦)

# هیچ کەسێک کامڵ نیە

ڕۆژێك هاوڕێیەکی حەکیمێك، لە حەکیمەکەی پرسی:

- ئایا تا ئەم کاتە بیرت لە هاوسەرگیریی نەکردووەتەوە؟.

- حەکیمەکە وەڵامی دایەوە و گوتی: با، کاتێك گەنج بووم بیرم لێکردەوە.

-ئەی چی بوو؟

حەکیم: سواری کەرەکەم بووم، چووم بۆ (هندستان). لەوێ کیژێکی زۆر جوانم ناسی. بەڵام کە لێی نزیك بوومەوە. مێشکی هیچی تیا نەبوو!. بۆیە هاوسەرگیریم لەگەڵ نەکرد.

ئەوێم جێهێشت و چووم بۆ (شیراز)، لەوێش کیژێکم ناسی، زۆر ژیربوو، بەڵام زۆر کرێت و ناشیرین بوو!!!

ئیتر لەگەڵ ئەویش هاوسەرگیریم نەکرد.

ئینجا ئەوێشم جێهێشت و چووم بۆ (بەغداد)، لەوێ کیژێکم ناسی، هەم ژیر بوو، هەمیش جوان.

بەڵام هاوسەرگیریم لەگەڵی نەکرد.

-بۆچی کێشە چی بوو؟

حەکیم: ئاخر ئەویش وەك من بەشوێن کەسێکدا دەگەڕا هەم زیر بێت، هەمیش جوان، ئەو کەسەش من نەبووم!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هیچ کەسێك لە دونیادا کامل نییە، هەیە جوانە، زیر نییە، هەیە زیرە، جوان نییە، هەیە دەوڵەمەندە، وەلێ نەزانە، هەیە زانایە، وەلێ هەژارە و...تاد.
- پێش ئەوەی مرۆڤ بە دوای عەیب و عاری خەڵکدا بگەڕێت، پێویستە عەیب و عارەکانی خۆی بدۆزێتەوە.
- خودای مەزن ژیانی ئاوا دروست کردووە، کە مرۆڤەکان یەکتری تەواو بکەن و یەکتر تەواوکەر بن، نەك یەکتر بڕ و یەکتر قڕکەر بن.
- ......................................................
- ......................................................
- ......................................................

# چیرۆکی

## (١٠٧)

## بەرهەمی ڕاستگۆیی

یەکێك لە شازادەکان بە نیازی هاوسەرگیری بوو. بۆ ئەم مەبەستەش هەموو کچانی ئەو شارەی بانگهێشتی کۆشك کردن. تا لە ناویاندا ئەو کەسە هەڵبژێرێت، کە خۆی دەیەوێت. کچەکانیش زۆربەیان کەیفیان بەوە دەهات ببنە هاوسەری شازادە. پیرەژنێکیش، کچەزایەکی خۆی لە لابوو! زۆر بە شێوەیەکی باش پەروەردەی کردبوو. ئەویش گوتی دەڕۆم. پیرەژن بەکچەکەی گوت: مەڕۆ، چونکە سوودی نابێت. ئەو شازادانە بەشوێن کەسی وەك تۆدا ناگەڕێن. بەهەرحاڵ کچەکە ڕۆیشت!!!!!

-شازادە هاتە ناو کچەکان، تورەکەیەکی تۆوی پێبوو.

گوتی: یەکێ تۆوێکتان دەدەمێ. هەر کەسێك دوای حەوت مانگ، گوڵێکی جوانم بۆ بهێنێت لەو تۆوە. دەیکەمە هاوسەری خۆم. هەمووان تۆوەکەیان وەرگرت و ڕۆیشتنەوە ماڵەوە. کچەزای پیرەژنەکە تۆوەکەی ناشت، هیچی لێ سەوز نەبوو. نەنکیشی ڕێگەی نەدا هیچ دەستکاری بکات، گوتی چۆنت هێناوە، وا بیگەڕێنەوە.

کاتی وادەی دیدار هاتەوە. فنجانی بە خاڵی بردەوە. بینی هەموو کچەکانی دیکە. هەریەکە و فنجانێك گوڵی جوانیان هێناوە. شازادە هاتە

ناویان گەڕا، لەناو هەموویاندا، دەستی کچەزای پیرەژنی گرت و گوتی:
من ئەم کچەم دەوێت!!!!

هەمووان نیگەران بوون. گوتیان تۆ چۆن ئەو کچەت دەوێت، خۆ ئەو کچە هیچ گوڵێکی نەهێناوە، تۆ پەیمانت نەدا لەو تۆوە جوانترین گوڵ هەڵبژێری؟

- شازادە گوتی: بەڵێ وایە. ئەو تۆوەی پێمدان، تۆوی گوڵ نەبوو. بەڵکو بەردی بچکۆڵە بوو.

بەڵام هەمووتان فێڵتان لێکردم، تەنیا ئەم کچە نەبێت، ئەو لەگەڵم ڕاستگۆ بوو، بۆیە ئەم کچە هەڵدەبژێرم و دەیکەمە هاوسەری خۆم..!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- ڕاستگۆیی قورسە، بۆیە هەڵگرانی کەمن.
- مرۆڤی ڕاستگۆ، هەمیشە سەربەرز و سەرفیرازە، بەڵام مرۆڤی درۆزن و چەواشەکار، هەمیشە ڕیسوا و شەرمەزارە.
- داری ڕاستی تاڵە، بەڵام بەرهەمەکەی شیرینە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١٠٨)

## ژنێکی ڕەگەزپەرست و خۆبەزلزان

ژنێکی سپی پێست، کە تەمەنی پەنجا ساڵ دەبوو، لە فڕۆکەیەکدا، لە تەنیشت پیاوێکی ڕەش پێست دانیشت!!!

ئەو ژنە زۆر هەستی بە دڵتەنگی و بێزاریی کرد، ناچار یەکێک لە خزمەتگوزارانی فڕۆکەوانی ناو فڕۆکەکەی بانگکرد و پێی گوت: (وا دیارە تۆ ئەم بارودۆخەی من نابینیت؟ منتان لە تەنیشت پیاوێکی ڕەش پێست دانیشاندووە، من بەوە ڕازی نابم لەلای کەسێکی پیس دابنیشم، پێویستە جێگەیەکی ترم بۆ دابین بکەن)!!!

خزمەتگوزارەکەش گوتی: خانمەکەم ئارام بەرەوە، هەموو کورسییەکان خەڵکی لێیە، بەڵام هەوڵ دەدەم جێگەیەکی بەتاڵت بۆ بدۆزمەوە!!!

خزمەتگوزارەکە ماوەی چەند خولەکێک دیار نەما، پاشان گەڕایەوە و گوتی: خانمەکەم وەک پێشتر گوتم: هیچ شوێنێکی بەتاڵ نییە بۆ سەرنشینە گەشتیارەکان، کاپتنی فڕۆکەکەشم ئاگادارکردەوە، ئەویش پێی ڕاگەیاندم: جێگەی بەتاڵیش نەماوە لە کورسیی بازرگانەکان، بەڵام کورسییەکی بەتاڵ هەیە لە کورسییەکانی کەسە ناودارەکان.

پـێش ئەوەی ئـافرەتە سـپی پێسـتەکە قسـە بکـات، خزمەتگوزارەکـە گـوتی:(لای ئـێمە شتێکی ئاسایی نیـیە، کە گەشـتیارێکی ئاسـایی لە شـوێنی کەسـێکی نـاودار دابنیـێین، بەڵام بەهـۆی ئەم بـارودۆخەی تـۆوە ناچـارین ئەمە بکەیـن، کـاپتنیش پێـی خـۆش نیـیە گەشـتیارێک لەلای کەسێکی پیس دابنیشێت !!!

خزمــەتگوزارەکە بەرەو ڕووی پیــاوە ڕەش پێســتەکە ڕۆیشــت و پێــی گوت:(گەورەم، دەتوانی جانتا تـایبەتییەکەت هەڵبگریـت و بەدوامـدا بێیت، ئێمە شوێنێکی پلە یەك و تایبەتمان بۆ تۆ تـەرخان کردووە، کە تایبەتـە بـە کەسە ناودارەکانەوە!!!!!!

لەو کاتەدا هەمـوو سەرنشـینەکان، کە لە سـەرەتاوە ئاگاداری کێشـەکە بوون، هەستانە سەرپێ و دەسـتیان کـرد بە چەپڵەلێدان بـۆ خزمەتگوزارەکە، کە ئـەو هەڵوێستە جوانـەی نوانـد و، ژنە ڕەگەزپەرست و خۆبەزلزانەکەشـی ڕیسوا و شەرمەزارکرد...

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤی ڕەگەزپەرست و خۆبەزلزان، خۆی پێ گەورەیە، بەڵام لە چاوی خەڵکدا زۆر سووك و بچووکە!!!!
- پێویستە جیاوازی نەکەین لە نێوان ڕەش و سپی و کورت و درێژ و هەژار و دەوڵەمەند و نێر و مێ، چونکە هەموومان مرۆڤین و لە خۆڵ دروست کراوین.
- گەورەیی مرۆڤ لە خاکیبوونەکەیدایە!!!!
- ..........................................................
- ..........................................................
- ..........................................................

# چیرۆکی

## (١٠٩)

## پاشایەکی ستەمکار و گەلێکی گەمژە!

لە دێر زەمانەوە، پاشایەکی ستەمکار هەبوو، گەلەکەی دەچەوساندەوە، هۆکاری ئەمەش بۆ زەلیلی و بێ هەڵوێستی ئەو خەڵکە دەگەڕایەوە کە لە ژێر ڕکێفی ئەودا دەژیان.

پاشا، دەستپێکی ستەمەکەی، لە باجەوە دەستی پێکرد و فەرمانی بە دارودەستەکەی کرد، کەوا باج و سەرانە لە خەڵکی بستێنن!!

ئەوانیش دەستبەجێ فەرمانی جەنابی پاشایان جێبەجێ کرد!

خەڵکەکەش هیچ هەڵوێستێکیان نەبوو و ملکەچی فەرمانی پاشایەکەیان بوون!!!

دوای ماوەیەك، پاشا بێ هەڵوێستی خەڵکەکەی قۆزتەوە و فەرمانێکی دیکەی دەکرد و داوی لە داروەستەکەی کرد کەوا باج و سەرانەکە بیکەن دوو قاتەوە!!!

داروودەستەکەی پاشا، گوتیان قوربان، ئەمە باری شانی خەڵکەکە قورس دەکات و دەترسێین کاردانەوەیان هەبێت؟!

بەڵام پاشاکە کەسێکی عاقڵ بوو، درکی بەو ڕاستییە کردبوو، کەوا خەڵکەکە هیچ هەڵوێستێك نانوێنێ و هیچ کاردانەوەیەك لە خۆی نیشان نادات!!

بۆیە داوای کرد دەستبەجێ فەرمانەکەی جێبەجێ بکەن!!

ئەوانیش باجەکەیان لەسەر خەڵکەکە کرد بە دوو هێندە، لەگەڵ ئەوەشدا، خەڵکەکە هیچ هەڵوێست و کاردانەوەیەکی نەبوو، چونکە زۆر گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی پاشای خۆیان بوون!!!

دوای ماوەیەکی دیکە، پاشا فەرمانی بە دارودەستەکەی کرد کەوا ڕۆژانە باجی ئەو پردەش لە خەڵکەکە وەربگرن، کە بۆ کارو کەسابەت بەسەریدا دێن و دەچن وهاتوچۆ دەکەن، هەروەها کاتێ دەشپەڕنەوە شاپێکی تێهەڵبدەن!

داروودەستەکەی پاشا دوودڵ بوون لە سەرگرتنی ئەم بڕیارەی پاشا، چونکە پێیان وابوو خەڵکەکە قبووڵی ئەم زوڵم و ستەمە ناکەن و کاردانەوەیان دەبێت و ڕادەپەڕن!

بەڵام پاشا، سوور بوو لەسەر جێبەجێ کردنی فەرمانەکەی و فیعلەن فەرمانەکەی بەسەر خەڵکەکەدا سەپاند!!!!

کاتێ ڕەعیەتەکانی پاشا هەموو بەیانییەك لە پردەکە دەپەڕینەوە، لەلایەن نۆکەرێکی پاشاوە شاپێکیان تێهەڵدەدرا و باجی پردەکەشیان لێ دەستاند!!

خەڵکەکە لەسەر دانی باج و لێدان ڕاهاتبوو!! بەڵام بەهۆی قەلەبالغی و زوو بەرێنەکردنیانەوە بۆ سەر کارەکانیان، تووشی کێشە و گرفت بوو بوون، بۆیە بڕیاراندا هەموو پێکەوە بچنە لای جەنابی پاشا و داواکارییەکەیان بەرزکەنەوە.

کاتێ پێکەوە چوونە بەر دەرگای کۆچکی پاشا!! داروودەستەکەی پاشا وایان زانی قەوما و خەڵکەکە لە دژی پاشا ڕاپەڕین!!

بەڵام کە پاشا هاتە دەرەوە و خەڵکەکەی بینی و پێی گوتن چیتان دەوێت؟

گوتیان قوربان! تۆ بۆ وەرگرتنی باجی پردەکە و شاپ تێهەڵدانامان، تەنیا کەسێکت داناوە، ئێمەش زۆرین و خاوەن کار و کەسابەتین و لە ئیش و کارەکانیمان دوا دەکەوین، چونکە درەنگ نورەمان دەگاتێ!!! بۆیە داواکارین چەند کەسێکی دیکەمان بۆ زیاد بکەی، بۆ ئەوەی زوو باجی پردەکەمان لێ بستێنن و شاپمان بدەن! تاکو بتوانین لە کات و ساتی خۆیدا بە کارەکانمان ڕابگەین و لە ئیشەکانمان دوانەکەوین!!!

جەنابی پاشاش داواکاری خەڵکەکەی جێبەجێ کرد!!!!!!!!!!!!!

**پەندو ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- تا مرۆڤ فێڵ لە خۆی نەکات، کەس ناتوانێ فێڵی لێ بکات.
- مرۆڤ کەم بژیت بەڵام مەردانە بژیت، نەك زۆر بژیت، بەڵام بەسەرشۆڕی بژیت.
- مرۆڤ ئەگەر چاوی لە غەدر و ستەمێکی بچووك نووقاند! چاو لە غەدر و ستەمێکی گەورەش دەنووقێنێت.
- نابێ مرۆڤ هەمبەر کاری هەڵە و ناڕاست، بێدەنگ و بێ هەڵوێست بێت.
- یێکەسی شاعیری دەڵێ: کاکە خوای ئیشی نابەجێ ناکا، تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا!!!
- پاشا و ئاغاکان، دروستکراوی دەستی خەڵکن، بۆ دەبێ خەڵکەکەش ئەو باجە بدەن و ئەو شاپە بخۆن!!!!!
- ..........................................................
- ..........................................................
- ..........................................................

# چیرۆکی

## (١١٠)

## قورئان و مردوو

کەسێك، سواری ئۆتۆمبێلێکی تاکسی بوو، لە ناو تاکسییەکە گوێبیستی دەنگی قورئان بوو، بە شۆفێرەکەی گوت: خێرە... چی قەوماوە، خۆ کەس نەمردووە؟

شۆفێرەکەش گوتی: با... دڵەکانمان مردوون!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- قورئانی پیرۆز، بۆ زیندووەکان هاتووە، بەڵام مخابن، زیاتر لە پرسە و گۆڕستانەکان دەخوێندرێتەوە!!!!
- بە ئاوی قورئان، دەتوانین دڵە مرووەکانمان زیندوو بکەینەوە، چونکە قورئان بەهاری دڵەکانە.
- بۆ ئەوەی دڵەکانمان نەمرن، پێویستە بە قورئان ئاو بدرێن.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١١١)

## گای شاخدار

له عەنتەری کوڕی شەددادیان پرسی: بۆچی هەمیشه له گای شاخدار دەترسیت؟

وەڵامی دایەوە: چونکه گا شاخی هەیه و عەقڵی نییه!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤی نەزان، وەك گای شاخدار مەترسیداره، چونکه چاکه و خراپه و ڕاستی و ناڕاستی لێکجیاناکاتەوه.
- مرۆڤی ژیر نابێ له کەسێك نزیك بێتەوه که عەقڵی نەبێت، یان عەقڵی بەکارنەهێنێت، چونکه مرۆڤی بێ عەقڵ، له گیانداری بێ عەقڵ زیانبەخشتره.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١١٢)

## تاقیکردنەوەی پێشەوا عومەر؟

پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب، لەشکری موسڵمانانی لە شام بەسەرکردەوە، کاتی نان خواردن،(ئەبو عوبەیدە)ی سەرکردەی لەشکری موسڵمانان، بە پێشەوا عومەری گوت: حەزت لەو خواردنەیە کە لەشکر دەیخوات، یان سەرکردەی لەشکر دەیخوات؟

پێشەوا عومەر گوتی: حەز دەکەم هەردوو خواردنەکە ببینم!!!

خواردنی لەشکریان بۆ هێنا، بریتی بوو لە ئاوگۆشت!

بەڵام خواردنی سەرۆکی لەشکریان بۆ هێنا، بریتی بوو لە نانی ڕەق و کۆپێك شیر!!!!!

کاتێ پێشەوا عومەر ئەمەی بینی، گوتی: ڕاستی فەرموو ئەو کەسەی گوتی: ئەبو عوبەیدە ئەمینی ئەم ئوممەتەیە!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- دەبێ سەرکردە وەك ئەبو عوبەیدە، کەسێکی دەستپاك بێت و حیسابی پاك بێت.
- دەبێ سەرکردە وەك ئەبو عوبەیدە، کەسێکی دادپەروەر بێت و جیاوازی نەکات لە نێوان خۆی و هەژار و لێقەوماوەکاندا.
- دەبێ سەرکردە وەك ئەبو عوبەیدە، کەسێکی خاکەڕا (متواضع) بێت و خۆی بەسەر ڕەعیەتەکانیدا هەڵنەکێشێت!!
- دەبێ سەرۆکی وڵات، هەمیشە چاودێر بێت بەسەر هەموو بەرپرسەکانەوە، بۆ ئەوەی سنووری خۆیان نەبەزێنن.
- دەبێ سەرکردە، سەنگەری خۆی، لە سەنگەری خەڵك جیا نەکاتەوە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی
## (١١٣)
## خەفەت مەخۆ

پیاوێکی خەمبار، سەردانی پیاوێکی زانای کرد و پێی گوت: لە مێژە بە دەست خەم و خەفەتەوە دەناڵێنم، نازانم چی بکەم؟

زاناکە گوتی: دوو پرسیارت لێ دەکەم، بەڕاستی وەڵامم بدەرەوە:

پرسیاری یەکەم: کە هاتی بۆ دونیا، خەم و خەفەتت لەگەڵ خۆت هێنابوو؟

پیاوە خەمبارەکە گوتی: نەخێر!!!

پرسیاری دووەم: کە دونیات جێهێشت، خەم و خەفەت لەگەڵ خۆت دەبەیتە گۆڕەوە؟

پیاوە خەمبارەکە گوتی: نەخێر!!!

زاناکە گوتی: مادەم تۆ خەمت نەهێناوە و خەمیش لەگەڵ خۆت نابەیتە گۆڕەوە، کەواتە هێندە خەم و خەفەت مەخۆ و لەسەر بەلا و موسیبەتەکان ئارام بگرە و لەبری زەوی، ڕوو لە ئاسمان بکە، خودای دلۆڤان نزاکانت گیرا دەکات و دەرگای خێرت لێ دەکاتەوە....

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- خەم و خەفەتەکان، کلیلی چارەسەری کێشەکان نین، بۆیە دەبێ کار لەسەر چارەسەرکردنی ئەو هۆکارگەلانە بکەین، کە دەبنە سەرچاوەی خەم و خەفەتەکان، نەك دەستەوەستان، بەدیار خەم و خەفەتەکانەوە دابنیشین!!!!
- مرۆڤی ژیر، چارەنووسی خۆی ناداتە دەست خەم و خەفەتەوە، بەڵکو هەوڵدەدات خەم و خەفەتەکان بگۆڕێت بۆ خۆشی و شادی.
- ئەگەر مرۆڤ خەم و خەفەتی هەبێت، پێویستە بچێتە لای کەسانی پسپۆر و شارەزا، بۆ ئەوەی ڕێنمایی و ئامۆژگاری بکرێت، چونکە زۆرجا خەم و خەفەت دەبێتە هۆی نەخۆشی جیاجیا، وەك: خەمۆکی و گۆشەگیری و دوورەپەرێزی و بەدگومانی و خۆکوژی و...تاد.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١١٤)

## جووڵەکەیەکی سوالکەر

لە سەردەمی خەلافەتی پێشەوا عومەر، جوولەکەیەکی ئەختیار و پشت چەماوە! خەریکی سوالکەری بوو! پێشەوا عومەریش، بە بینینی ئەو دیمەنە، تووشی شۆك بوو!

خۆی لێ نزیك کردەوە و لێی پرسی: ها خێرە! بەو تەمەنەوە سوالکەری دەکەیت؟

ئەویش گوتی: من کەسێکی جوولەکەم، کاتێ کە گەنج بووم، کارم دەکرد و باجیشم دەدا دەوڵەت! بەڵام ئێستا پیر بوویمە و توانای کارکردنم نەماوە و هیچ داهاتێکیشم نییە و کەسیشم نییە بەخێوم بکات!!

بۆیە ناچارم سوالکەری بکەم!!

پێشەوا عومەریش بە خزمەتکارەکانی فەرموو: لەمەودوا ئەم پیرەمێردە لە باج ببەخشرێت و لە(بیت المال)ی موسڵمانانیش مووچەیەکی بۆ ببڕنەوە، کە تا ماوە پێی بژیت و جارێکی دیکە ناچار نەبێت سوالکەری بکاتەوە......

## پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:

- پێویستە کەسی بەرپرس، دادپەروەر و دادگەر بێت و دەبێ بە یەك چاو سەیری هەموو ڕەعیەتەکانی خۆی بکات و جیاوازی لە نێوان ئەم و ئەودا نەکات .
- دەبێ کەسی بەرپرس هەمیشە لە گەڕان و سووڕان دەبێت، تاکو بزانێت چ کێشە وگرفتێك لەناو میللەتەکەیدا هەیە، تاکو بۆ هەر کێشەیەك چارەسەرێك بدۆزێتەوە.
- هەر کەسێك، شتێکی چاند، نابێت لە بەرەکەی بێبەش بکرێت، چونکە مافی خۆیەتی لێی بخوات.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١١٥)

## سزای کوشتن، کوشتنه!!

ئەفسەرێکی عێراقی، بەم شێوەیە ئەم بەسەرهاتە سەیرە دەگێڕێتەوە:
پیاوێکی قەصاب هەبوو، کاری قەصابی دەکرد، ڕۆژێك لە ڕۆژان، بینی ژنێك دراوەتە بەر چەقۆ و لەسەر شەقام کەوتووە!!!

ئەویش هەستی دەجووڵێ و سکی پێ دەسووتێ و بە جل و چەقۆی قەصابییەوە بەهانایەوە دەچێت!!!

خەڵکێکی زۆر لێی کۆدەبنەوە و بە کوشتنی ئەو ژنە تۆمەتباری دەکەن!!!

هەر چەند قەصابەکە هەوڵیدا ئەستۆپاکی خۆی بسەلمێنێت، بەڵام خەڵکەکە بڕوای پێ نەکرد و خێرا پۆلیسی ئاگادارکردەوە و پۆلیس زووگەیشتە شوێنی مەبەست و قەصابەکەی قۆڵبەست کرد و بردییە زیندان!!!!

دوای دوو مانگ لە لێکۆڵینەوە، قەصابەکە هەر سووربوو لەسەر ئەوەی کە بێ تاوانە، بەڵام دادگا بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەکرد، چونکە چەند کەسێك گەواهییان دا، کە ئەویان بە تەنیا لەسەر جەنازەی ئەو ژنە بینیوە و چەقۆی پێ بووە!!!

ڕۆژی لە سێدارەدانی قەصابەکە دیاری کرا، قەصابەکە داوی کرد کە پێش ئەوەی لە سێدارەی بدەن، گوێ لە قسەکانی بگرن، ئینجا بەم شێوەیە بەسەرهاتی خۆی و ژنێکی گێڕایەوە: پێش ئەوەی ببم بە قەصاب، بە بەلەم خەڵکم لە ئاوی فورات دەپەڕاندەوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان، ئافرەتێکی جوان لەگەڵم سوار بوو، زۆر پێی سەرسام بووم.

سۆراغم کرد و چوومەماڵیان و خواستبێنیم کرد، بەڵام ئەو ئافرەتە ڕەتی کردەوە شووم پێ بکات!!!

دوای ساڵێك، جارێکی دیکە، ئەو ئافرەتەم دیتەوە، منداڵێکی ساوای پێبوو، لەگەڵ منداڵە بچکۆلانەکەی، سواری بەلەمەکەم بوون، ئافرەتەکەم ناسییەوە، هەر چەند هەوڵم دا، دان بەخۆمدا بگرم، بەڵام خۆم پێ ڕانەگیرا و داوام لە ئافرەتەکە کرد کە خۆی تەسلیم بە من بکات! بەڵام ئەو بە توندی ڕەتی کردەوە! ئینجا هەڕەشەم لێکرد، کە ئەگەر خۆی تەسلیم بەمن نەکات، ئەوا منداڵەکەی فڕێ دەدەمە ناو ئاوی فوراتەوە!!!

بەڵام ژنەکە ڕازی نەبوو، کە کاری فاحیشام لەگەڵدا بکات!!!

بۆیە سەری منداڵەکەم خستە ناو ئاوەکەوە، هەر چەند دایکی منداڵەکە دەستی بە گریان و هات و هاوارکرد و زۆر لێم پاڕایەوە! بەڵام من هەر سووربووم لەسەر خنکاندنی، تا دەنگی منداڵەکە کپ بوو!!! کە منداڵەکە مرد، فڕێم دایە ناوی ئاوی فوراتەوە، ئینجا دایکی ئەو منداڵەشم کوشت و فڕێم دایە ناو ڕووبارەوە.

پاشان بەلەمەکەم فرۆشت و وازم لە کاری بەلەمڤانی هێنا و دەستم بە کاری قەصابی کرد!!!!

بۆیە ئەو سزایەی کە ئێستا بەسەرمدا سەپێندراوە، سزای ئەو تاوانەیە کە دەرهەق بەو منداڵ و دایکە بێ تاوانە کردوومە، بەڵام سەبارەت ئەو ژنەی کە لە جادە کوژراوە، ئەوا بکوژەکەی بدۆزنەوە، چونکە من بکوژی ئەو نیم!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- خودا مۆڵەتی ستەمکار دەدات، بەڵام هەر تۆڵەی لێدەکاتەوە.
- مرۆڤ چی بچێنێت، ئەوە دەچنێتەوە.
- ئەوەی چاڵ بۆ خەڵکی لێبدات، خۆی دەکەویتە ناوی.
- نابێ مرۆڤ جڵەوی عەقڵی خۆی بداتە دەست هەوا و هەوەسی خۆی، چونکە مرۆڤ بەرەو چارەنووسێکی ڕەش و نادیار دەبات.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١١٦)

## منداڵێکی ژیر

پاشایەك، سەردانی ماڵی یەکێك لە وەزیرانی خۆی کرد، وەزیرەکە، کوڕێکی هەبوو، بە کەسێکی ژیر ناوبانگی دەرکردبوو، پاشایەکەش ویستی ئەو کوڕە تاقی بکاتەوە، ئاخۆ پلەی ژیرییەکەی چەندە؟ بۆیە لێی پرسی: ماڵی پاشا خۆشترە، یان ماڵی باوکت؟

ئەو کوڕە ژیرەش کەمێك داما، چونکە نەیزانی لە نێوان ڕێزی باوك و شکۆی پاشا، کامیان هەڵبژێرێت؟!

بەڵام ژیرانە وەڵامی پاشای دایەوە و گوتی: قوربان! مادەم پاشا لە ماڵی باوکمە، ئەوا ماڵی باوکم، لە ماڵی پاشا خۆشترە!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤی ژیر، نابێ لە خۆڕا وەڵام بداتەوە، بەڵکو دەبێ وەڵامەکەی ئامانجی خۆی بپێکێ.
- مرۆڤ دەبێ لە ژیاندا هاوسەنگی ڕاگرێت و نابێ کەسێك لەسەر حیسابی کەسێکی دیکە بەرزکاتەوە.
- ئەزموون و تاقیکردنەوە، سەنگی مەحەکە بۆ ناسینی کەسەکان و شتەکان.

# چیرۆکی
## (١١٧)
## گەنجێکی داوێن پاك

گەنجێکی قۆز، کاری دەستفرۆشی دەکرد و قوماشی دەفرۆشت، بۆیە هەموو ڕۆژێ لە کۆچە و کۆڵانەکان دەگەڕا و دەسووڕایەوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان، گەیشتە پێش دەرگای ماڵێك، ئەو ماڵە تەنیا ژنێکی لێ بوو، ژنەکە، کە بینی گەنجێکی قۆز و جوانە، دڵی بۆ گەنجەکە چوو!!!! بۆیە گازی کرد و پێی گوت، ئەگەر بێیتە ژوورەوە، بۆ ئەوەی بە دڵی خۆم کراسێك بۆ خۆم هەڵبژێرم!!!!

گەنجەکەش، بە دڵێکی پاکەوە چووە ژوورەوە، ژنەکە، دەرگای ژوورەکەی داخست و ڕووی لە گەنجەکە کرد و گوتی: تۆ دوو ڕێگەت لە پێشە: یان کاری فاحیشەم لەگەڵدا دەکەیت، یان دەیکەمە هات و هاوار و هەموو جیرانەکانم لێرە خڕدەکەمەوە و پێیان دەڵێم ئەم کوڕە دەیەوێ تەعدام لێ بکات!!!!

هەر چەند کوڕەکە هەوڵی دا، کە ژنەکە ڕازی بکات کە دەستبەرداری داوایەکەی بێت و پێی گوت: لە خوا بترسێ، بەڵام سوودی نەبوو!!!!

بۆیە بیرۆکەیەکی بە مێشکدا هات و گوتی: باشە من ڕازیم، بەڵام دەمەوێ پێش ئەوەی ئەو کارە بکەم، بچمە حەمام و خۆم پاك بکەمەوە،

ژنەکەش بەو قسەیە زۆر دڵخۆش بوو و ڕێی پێدا بچێتە حەمام خۆی بشوات!!!

گەنجەکە چوو ئاودەستێ و دەستی بۆ پیسایی برد و، دەموچاو و هەموو جەستەی خۆی پێ شێلا!! ئینجا هاتە دەرەوە و بە ژنەکەی گوت: فەرموو من ئامادەم!!!

کاتێ ژنەکە، گەنجەکەی بەو شێوەیە بینی، کە هەموو جەستەی بووە بە پیسایی!!! هەستی بە بێزاری کرد و دەرگای خانووی لێکردەوە و پێی گوت: خێرا ئێرە جێبێڵە و ون بە!!!!!

گەنجە داوێن پاکەکەش، چونکە نیازێکی پاکی هەبوو و حەزی لە کاری فاحیشە نەبوو، بۆیە بە سەربڵندی لەو بەلایە ڕزگاری بوو و گەڕایەوە ماڵەوە و خۆی لە پیسایی پاککردەوە و بۆنێکی خۆشی لە خۆی دا..!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ خوا ڕاستگۆ بێت، بێگومان خوا لە کاتی تەنگانەدا بەهانایەوە دەچێت و ڕزگاری دەکات.
- مرۆڤ کاتێ ڕووبەڕووی کێشەیەك دەبێتەوە، نابێ تەسلیمی واقع بێت، بەڵکو دەبێ بیر بکاتەوە و باشترین بڕادە هەڵبژێرێت، بۆ ئەوەی خۆی لەو کێشەیە ڕزگار بکات.
- پێویستە مرۆڤ نەچێتە شوێنێکەوە، کە گومانی ئەوەی لێ بکرێت، ڕووبەڕووی کێشە و گرفت دەبێتەوە.

# چیرۆکی

## (١١٨)

## حەز دەکەم ببم بە تەلەفزیۆن

هەموو قوتابیانی پۆلی چوارەمی بنەڕەتی، کتێبی کوردییان دەرهێنابوو، چاوەڕوانی مامۆستا بوون، بۆ ئەوەی وانەیەکی نوێ بخوێنن.

مامۆستای وانەی کوردی، دەرگای پۆلی کردە وگوتی: بەیانیتان باش، هەموو قوتابییەکان، پێکەوە و بە یەك دەنگ گوتیان: ژیانت باش، مامۆستای بەڕێز و باش!!!!

مامۆستا ڕووی لە قوتابیان کرد وگوتی: قوتابییە خۆشەویستەکانم، ئەم وانەیە تایبەت دەکەم بە حەز و خولیاکانی ئێوە، حەز دەکەم بزانم لە ئایندەدا دەتانەوێ ببن بەچی؟!!!!

بۆ ئەم مەبەستەش، کاغەزێکی سپی دەربێنن و چیتان لە ناو مێشکدا هەیە، بۆم بنووسن، ئایا دەتانەوێ ببن بە دکتۆر... یان ئەندازیار... یان فڕۆکەوان...یان پارێزەر.... یان دادوەر و مامۆستا و.....تاد. بەڵام دەبێ هۆکارەکەیشی بنووسن، ئاخۆ بۆچی ئەو بابەتەتان هەڵبژاردووە!!!!

قوتابیان، دەستیان بە نووسینی حەز و خولیای خۆیان کرد، کە تەواو بوون، وەرەقەکانیان دایە دەست مامۆستا.

لە ماڵەوە، مامۆستا دەستی بە خوێندنەوەی پەیامەکانی قوتابییەکانی کرد:

ئـازاد نووسـیبووی: حـەز دەکـەم بـبم بـە دکتـۆر، بـۆ ئـەوەی یارمـەتی نەخۆشەکان بدەم.

نەوزاد نووسیبووی: حەز دەکەم ببم بە ئەندازیار، بۆ ئەوی بە شێوەیەکی ئەندازەیی، ڕێگا و بانەکان و جادە و شەقامەکانی کوردستان دروست کەم.

سەربەست نووسیبووی: حەز دەکەم ببم بە مامۆستا، بۆ ئەوەی قوتابیانی کورد فێری خوێندن و زانین و نووسین بکەم و لە نەزانین و نەفامی ڕزگاریان بێت.

سۆزان نووسیبووی: حەز دەکەم ببم بە پارێزەر، بۆ ئەوەی بەرگری لە مافی ستەملێکراوان بکەم.

دیار نووسیبووی، حەز دەکەم ببم بە فڕۆکەوان، بۆ ئەوەی گەشتیارانی جیهان بۆ کوردستان بگوازمەوە.

بەڵام ئەوەی سەرنجی مامۆستا بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، پەیامی(ئاری)بوو!!

ئاری، لە پەیامەکەیدا، ئاوا گوزارشتی لە حەز و خولیای خۆی کردبوو:

مامۆستاگیان: من دەمەوێ ببم بە تەلەفزیۆن، چونکە منیش حەز دەکەم وەك تەلەفزیۆن جێی بایەخی دایە و بابەم بم و گرنگیم پێ بدەن، مامۆستاگیان، دەزانم ئەگەر ببم بە تەلەفزیۆن، ئەوا دایك و باوکم منیان خۆش دەوێت و زیاتر کاتم بۆ تەرخان دەکەن و فەرامۆشم ناکەن.

چونکە باوکم ، کە ڕۆژانە لە ئیش دێتەوە، یەکسەر کۆنترۆڵی تەلەفزیۆنی پێیە و ئەم کەناڵ و ئەو کەناڵی پێدەکات و تا خەو نەیباتەوە، وازی لێ ناهێنێ!!!

دایکشم، شەوانە بە دیار فیلمەکانەوە دادەنیشێ و تا درەنگانی شەو سەیری فیلمە دۆبلاژکراوەکانی تورکی و ئێرانی دەکات!!!

منیش لە ماڵەوە هەست بە غەریبی دەکەم، چونکە دایك و باوکم منیان خۆشناوێ و شێت و شەیدای تەلەفزیۆنن، بۆیە حەز دەکەم لە ئاییندە ببم بە تەلەفزیۆن، بۆ ئەوەی دایك و باوکم منیان خۆش بوێت و لەگەڵم دانیشن و قسەم لەگەڵدا بکەن!!!!!!

دوای خوێندنەوەی پەیامی ئاری! فرمێسك لە چاوەکانی مامۆستا هاتنە خوارەوە و بڕیاریدا بە خۆی ئەو پەیامە بگەیەنێتە دایك و باوکی ئەو قوتابییە، بۆ ئەوەی گرنگییەکی زیاتری پێ بدەن و خۆشەویستییەکەی زیاتری پێ ببەخشن و پارێزگاری لەو ئەمانەتە بکەن، کە پێیان سپێردراوە...

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- منداڵ ئەمانەتێکە، لە ئەستۆی دایك و باوکیدایە، بۆیە دەبێ دایباب لە ئاست ئەو بەرپرسیارەتییە دابن کە پێیان سپێردراوە.
- پێویستە دایبابەکان کاتێکی زۆرتر بە منداڵەکانیان ببەخشن، بۆ ئەوەی هەست بە نامۆیی نەکەن و لێیان دوور نەکەونەوە.
- کاتێك دایك و باوك منداڵەکانیان فەرامۆش و پشتگوێ دەخەن، شتێکی سروشتییە، ئەوانیش کاردانەوەیان هەبێت و ئەو بۆشایە بە کەسانی دیکە پڕ بکەنەوە.
- پێویستە هەمیشە مامۆستا پردێك بێت لە نێوان منداڵ و ماڵەوە.
- منداڵ مرۆڤێکی هەستناسك و دەروونپاکە، قەت دووڕوویی نازانێ، بۆیە ئەوەی لە ناخیدایە، بە ڕاشکاوانە دەری دەبڕێ.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی

## (١١٩)

## قاوەی ژیان

چەند خوێندکارێکی دەرچووی  زانکۆ، کە لە قۆناغی زانکۆ پێکەوە بوون و دوای دەرچوونیان، هەر کامیان کارێکی چاکی پەیدا کردبوو و لە کارەکانیشیان سەرکەوتوو بوون، دوای ماوەیەك دابڕیان، لە شوێنێك کۆبوونەوە و بڕیاران دا پێکەوە بچنە زانکۆی خۆیان و مامۆستاکانیان بەسەر بکەنەوە.

ئەو هاوڕێیانە چوونە زانکۆ، لای یەکێك لە مامۆستاکانیان دانیشتن و دەستیان بە دان و ستاندن کرد، زۆربەی قسەکانیشیان گوزارشت بوو لە ناخۆشی و ئاستەنگەکانی ژیان!!!

لەو کاتەدا، مامۆستاکەیان خەریکی ئامادەکردنی قاوەیەك بوو بۆ خوێندکارە کۆنەکانی!!!

مامۆستاکە، زۆر جۆرە فنجانی لەسەر مێزەکە دانا، لەوانە: فنجانی شووشەیی، فنجانی پلاستیکی، فنجانی فەخفووری و فنجانی فافۆنی و ...تاد. ئینجا قاوە داغ و گەرمەکەیشی لەسەر مێزەکە دانا و داوای لە خوێندکارە کۆنەکانی کرد، کەوا هەر یەکێکیان فنجانێك بەدەستەوە بگرێ و قاوەیەك بۆ خۆی تێبکات!!!

کاتێ میوانەکان قاوەکەیان تێکرد! مامۆستاکەیان، هەروەك جاران، بە هێواشی و میهرەبانی ڕووی لە خوێندکارە کۆنەکانی کرد و گوتی: ڕۆڵەکانم: سەرنجم دا، هەمووتان فنجانە جوان و گرانبەها و سەرنجڕاکێشەکانتان هەڵبژارد و فنجانە هەرزانەکانیش لە شوێنی خۆیان مانەوە!!

میوانەکان، کە لە قسەی مامۆستاکەیان سەریان سوڕمابوو!! بێدەنگ بوون و قسەیان نەکرد و گوێیان بۆ مامۆستاکەیان شل کردبوو!!!

مامۆستاکەیان درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی: بەڕاستی ئەو شتەی کە ئارەزووتان دەکرد، خودی قاوەکە بوو، نەك فنجانەکان!! بەڵام ئێوە چاوتان بڕیبوو فنجانە جوانەکان و هەر یەکێکتان فنجانێکی هەڵبژارد!!

بۆیە حەز دەکەم بزانن کەوا،(ژیان)، وەك (قاوە) وایە، بەڵام هەرچی کار و پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و مافەکانن، وەك( فنجان) وان!!!

ڕاستە فنجانەکان جوانی بە ژیان دەبەخشن، بەڵام هەرگیز تامی ژیان ناگۆڕن!!

بێگومان هەڵبژاردنی فنجانی جوان و گرانبەها، قاوەتان لا خۆشەویستتر دەکات، بەڵام ئەگەر زیاد لە پێویست بیر لە فنجانەکان بکەنەوە، وا دەکات، کەوا تام و چێژ لە قاوەکە وەرنەگرن!!!!!

بۆیە تکاتان لێ دەکەم لەمەودوا بیر لە فنجانەکان مەکەنەوە، بەڵکو بیر لە قاوەکە بکەنەوە، بۆ ئەوەی تام و چێژی لێ وەربگرن و هەست بە تامە خۆشەکەی بکەن!!!!!

پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:

- پێویستە مرۆڤ سوود لە خودی ژیان وەربگرێت، نەك ئەو شتانەی کە ژیان دەڕازێننەوە!
- نابێ مرۆڤ ئامانج بکاتە قوربانی هۆکار.
- باخچەی ژیان پڕە لە گوڵ و گوڵزار، بەڵام مخابن هەندێ کەس هەست بە بۆنی ئەو گوڵانە ناکەن.
- پێویست مرۆڤ پەند لە قسەی مامۆستایانی زانا و دانا وەربگرێت.
- ..............................................................
- ..............................................................
- ..............................................................

## چیرۆكی

## (١٢٠)

## پاراستنی ئەمانەت

كێشە كەوتە نێوان پیاوێك و ژنێكەوە، كێشەكە گەورە بوو وگەیشتە حەددی تەلاق!!! هەندێ پیاو ماقول و ڕیشسپی چوونە لای پیاوەكە و پێیان گوت: لەسەر چی ژنەكەت تەلاق دەدەیت، هۆكارەكەمان پێ بڵێ، بۆ ئەوەی یارمەتیت بدەین؟!!!!!

پیاوەكەش گوتی: ئەوە نهێنی ماڵەكەمە، نابێ كەس ئەو نهێنییە بزانێت!!!!

دواتر، پیاوەكە و ژنەكە نەگەیشتن بە چارەسەر، بۆیە پیاوەكە ناچار بوو، هاوسەرەكەی تەلاق بدات.

دوای ئەوە، هەمان كەس چوونەوە لای پیاوەكە و پێیان گوت: خۆ ئێستا ئەو ژنە هاوسەرت نییە، حەز دەكەین هۆكاری تەلاقدانەكەی بزانین؟

پیاوە ئەمینەكە گوتی: كاتێ كە هاوسەرم بوو، نهێنی ئەو خاتوونەم پاراست، ئێستا كە هیچ پەیوەندییەكی بە منەوە نەماوە و موڵكی خەڵكی دیكەیە، چۆن دەبێت عەیب و عاری خەڵكی دیكە ئاشكرا بكەم؟!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- دەبێ مرۆڤ بۆ هەموو کەسێك و لە هەموو بارودۆخێکدا کەسێکی فرە ئەمین بێت.
- مرۆڤی ئەمین و ڕازگر، لای هەموو کەسێك خۆشەویستە.
- مرۆڤی ئەمین، جێی متمانەی هەموو خەڵکە، بە دۆست و دوژمنانییەوە.
- ئەگەر مرۆڤ ئەمین بێت، خەڵك پرس و ڕاوێژی پێ دەکات و کێشەکانی خۆی بۆ باس دەکات، چونکە نهێنی کەس ئاشکرا ناکات.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١٢١)

## زمانی درێژ، سەری ساحیبی دەخوات

ژنێکی فەرمانبەر، هەموو ڕۆژێ کە دەگەڕایەوەماڵەوە، باسی کچە هاوڕێیەکی بۆ پیاوەکەی دەکرد و پیا هەڵدەگوت و دەیگوت: کچێکی هاوپیشەم لەگەڵدایە، زۆر پێی سەرسامم، چونکە چەندی بڵێی کچێکی جوان و ڕۆح سووك و ڕەزا شیرینە!!!!!

پیاوەکەی، خۆی کڕ دەکرد، تەنیاگوێی بۆ ڕادەگرت!!!

ڕۆژی پاشتر، هەمان قەوانەی لێ دەدایەوە و دەیگوت: کچێکی چەند قسە خۆشە!!!!

دیسان پیاوەکەی، خۆی لە گێلی دەدا..!!

هەموو ڕۆژێ، ئەم بەزم و ڕەزمە بەردەوام بوو! هەر ڕۆژێك بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش، پەسنی ئەو کچەی دەکرد، ئەم هەموو مەدح و سەنایە، وای لە پیاوەکەی کرد کە بچێت سۆراغی کچەکە بکات و ببینێ و بزانێ ئەوە چ کچێکە هێندە مەدحی دەکات و بە بەژن و باڵی هەڵدەڵێت!!!!!

کاتێ پیاوەکە کچەکەی بینی، دڵی بۆ چوو و بوو بە عاشقێکی سەرسەختی ئەو کچە و بڕیاریدا بە فەرمی بچێتە خوازبێنی کچەکە، ماڵی کچەکە ڕازیبوون، کەوا کچەکەیان لێ مارە بکەن، دواجار ئەو کچە بۆ بە هەوێی ئەو ژنە!!!!!!

بۆیە دەڵێن: زمانی درێژ، سەری ساحیبی دەخوات!!!!!!!!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤی نەزان، بەدەستی خۆی گۆڕ بۆ خۆی هەڵدەکەنێت!!
- نابێ ژن لای پیاو مەدحی کچێکی دیکە بکات، نابێ پیاویش لای ژن، مەدحی کوڕێکی دیکە بکات، چونکە ئەمە هۆکارێکە بۆ بەلاڕێداچوون.
- دەبێ گاڵتە و سوعبەت لە سنووری خۆی تێنەپەڕێت، چونکە زیانی زیاتر دەبێ لە قازانجی.
- پێویست ژن هەوڵدات ئەو سیفەتانە لە خۆیدا بێنێتە دی، کە لای هاوسەرەکەی خۆشەویستن، بۆ ئەوەی لای پیاوەکەی خۆشەویست بێت، پیاویش هەر وا، هەوڵدات ئەو سیفەتانە لە خۆیدا بێنێتە دی، کە لای هاوسەرەکەی خۆشەویستن، بۆ ئەوەی لای ژنەکەی خۆشەویست بێت.
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (١٢٢)

## جووتیارێکی زانا

کاتێك لیژنەی هەڵسەنگاندن، جووتیارە سەرکەوتووەکەی بینی و خەڵاتی کرد.

تەماشایان کرد، بەرهەمی کێڵگەی دراوسێکانیشی زۆر باشن.

لێیان پرسی: چۆن بەرهەمی دراوسێکانت وەك تۆ باشە؟

جووتیارەکە گوتی: من لە تۆوە باشەکەی خۆمیان دەدەمێ!!

گوتیان: ئەی ناترسی پێشبڕکێت لەگەڵدا بکەن و زیانی ماددیت پێ بگەیەنن؟

گوتی: بەڕێزان من نامەوێ ئەوان تۆوی خراپ بەکاربێنن، چونکە ڕەشەبا ئەو تۆوە خراپەی ئەوان، دەخاتە کێڵگەکەی منیشەوە، بۆیە لە ڕاستیدا، من کە تۆوی باشیان دەدەمێ، کارێکە، منەتی تێدا نییە!!! چونکە ئەگەر کێڵگەی ئەوان باش بێت، ئەوا کێڵگەی منیش باش دەبێت!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- ئەوەی مرۆڤ بۆ خۆی گەرەکە، دەبێ بۆ خەڵکی دیکەش گەرەك بێت.
- نهێنیی سەرکەوتنی مرۆڤ لە فرت و فێل و تەڵەکەبازی و چەواشەکاریدا نییە، بەڵکو لە ڕاستگۆیی و دەست و دڵ پاکیدایە.
- ئەگەر بمانەوێ ژینگەیەکی تەندروستمان هەبێت، دەبێ هەر لە خەمی خۆماندا نەبین، بەڵکو لە خەمی ئەوانەش دابین کە خراپەکاری دەکەن و ژینگە پیس دەکەن.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی

## (١٢٣)

## خەڵات دڵەکان دەشوات

کەسێك بەم شێوەیە بەسەرهاتی خۆی و یەکێك لە خزمە نزیکەکانی دەگێڕێتەوە: خزمێکی نزیکم هەبوو، زمانێکی تیژ و زبری هەبوو، هەمیشە لە ناو خەڵك و لە پێش چاوی ئەوانی دیکەی قسەی پێ دەگوتم و بە زمانی، ئازاری دەدام و دەیشکاندمەوە و هەستی منی بریندار دەکرد!!!!

هەر چەند من تەمەنم شەست ساڵ بوو، ئەویش تەمەنی چل ساڵێك دەبوو!!! بەڵام ئەمە وای نەکرد کە ڕێزم بگرێت...

کەچی من هەمیشە لەگەڵی نەرم و نیان بوو و دوعام بۆ دەکرد... بەڵام سوودی نەبوو، چونکە ئەو لەسەر هەڵەی خۆی بەردەوام بوو....

جارێك بەبیرم دێت، لە کۆڕ(مەجلیس)ێك دانیشتبووین، بۆنێکی خۆشم لەخۆ دابوو، کەسێك بە تەنیشتمەوە بوو، گوتی: ماشاءالله چەند بۆنێکی خۆشت لەخۆ داوە!!!

ئەویش لێمانەوە نزیك بوو، گوتی ڕەنگە دزیبێتی!!!!!

برای ئەو کەسەم لە هەڵسوکەوتی براکەی ئاگادارکردەوە و پێم گوت: کاکت چی لەمن دەوێ، بەخوا لەبیرم نییە بە حەیاتم باسی ئەوم بە خراپە کردبێت و لە یادم نییە هیچ کێشەیەکم لەگەڵیدا هەبێت؟!!!

برایەکەی گوتی: کاکم کەسێکی ناجۆر و دەستنەخۆشە، بە گوێی کەسمان ناکات!!!!!!

جارێکیان، بەسەرهاتی خۆم و ئەو کەسەم بۆ خزمێکمان گێڕایەوە، گوتی: ئامۆژگارییەکەت دەکەم، ئەگەر بە گوێم بکەیت، قازانج دەکەیت؟

گوتم ئامۆژگارییەکەت چییە: گوتی پێم باشە لە بازاڕ خەڵاتێکی گرانبەهای بۆ بکڕی و لە نێوان مەغریب و عەیشا خەڵاتەکەی بۆ ببەیە ماڵەوە، ئەمەش دەبێتە نیشانەی نیازپاکی تۆ بەرامبەر بەو کەسە.

بەگوێی ئەو کەسەم کرد و چوومە بازاڕی گوڵاو فرۆشەکان و کامە بۆنی خۆش هەیە کڕیم.

ڕۆژی پاشتر، چوومە ماڵیان، لە دەرگام دا، بە ڕوویەکی گرژەوە دەرگای کردەوە و گوتی: ها دەتەوێ بێیتە ژوورەوە؟!!!!

گوتم: ئەی برای قەدرگران، من هیچ نیازێکی خراپم نییە، بە مەبەستی سەردان و ئەحواڵی پرسی، هاتوومەتە ماڵتان!!!!

تۆزێك پێکەوە دانیشتین و هەندێ قسەی خۆشم لەگەڵدا کرد، ئینجا ئیزنم لێوەرگرت و هەستامە سەرپێ و گوتم: تا لای ئۆتۆمبێلەکەم وەرە، کارێکم پێتە، دەرگای ئۆتۆمبێلەکەم کردەوە و خەڵاتەکەم دەرهێنا و گوتم: ئەم خەڵاتەم بۆ جەنابتان هێناوە!!!!!

بە خوا تۆم خۆش دەوێ، هیوادارم لێم وەربگری!!!!

ئەو کابرایە دەستی بە گریان کرد و گوتی: لێم ببۆرە، بەخوا من هەڵە بووم و دان بەوە دادەنێم کە دەرهەق بە تۆ زۆر هەڵەم کردووە!!!!!!

پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:

- مرۆڤی خۆڕاگر و ئارامگر و دان بەخۆداگر، هەمیشە سەرکەوتووە.
- خەڵات بەخشین، ڕۆڵێکی زۆر کاریگەری هەیە لەسەر سۆز و هەستی مرۆڤ.
- پێویستە لایەنی سێیەم هەمیشە ڕۆڵی خۆی ببینێت لە ئاشتکردنەوە و بە یەکگەیاندنی دوو لایەنی ناکۆك دا.
- هەڵە بە هەڵە ڕاست ناکرێتەوە، بەڵکو هەڵە بە ڕاستی و کاری جوان و شایستە ڕاست دەکرێتەوە.
- مرۆڤ بە لێبوردن، گەورە دەبێت و بە تۆڵەکردنەوەش بچووك دەبێتەوە.
- هەڵسوکەوتنی جوان، هەمیشە بەرهەمێکی جوانی هەیە، چونکە دەبێتە مایەی ڤیان و خۆشەویستی.
- ..........................................................
- ..........................................................
- ..........................................................

## چیرۆکی

(١٢٤)

## کەس ئاوڕم لێناداتەوە

بازرگانێك، بە سواری ئۆتۆمبێلە نوێیەکەی، کە لە جۆری (جاکوار) بوو، بە نێو یەکێك لە شەقامەکاندا، بە دڵێکی خۆشەوە بەرەو نووسینگەی کارەکەی دەڕۆیشت، لە ناکاو ئۆتۆمبێلە نوێیەکەی، کە چەند ڕۆژێك بوو، کڕیبووی، بە بەردێکی گەورە لە لای ڕاستی شەقامەکەوە پێکرا!

بازرگانەکە بە پەلە لە ئۆتۆمبێلەکەی دابەزی، تا بزانێت کێ بوو ئەو بەردەی گرتە ئۆتۆمبێلەکەی و سەیری ئەو زیانەش بکات کە بەر ئۆتۆمبێلەکەی کەوتووە!!!!

لەو کاتەدا منداڵێکی بینی، لە سووچێکی شەقامەکەدا وەستابوو، کە بە ڕوخسارییەوە نیشانەی ترس و دڵەڕاوکێ دیار بوو!!!!

بازرگانەکە، لە کاتێکدا، پەستی و تووڕەیی، نێوچەوانی تاریك کردبوو، لە منداڵەکە نزیك بووە...

یەخەی منداڵە بێچارەکەی گرت و بە دیوارەکەوە نووساندی و زۆر بە تووڕەیی پێی گوت، نەزان بۆچی ئەو کارەت کرد، بۆ ئۆتۆمبێلەکەمت لەکەدار کرد، بۆ ئەو بەردەت گرتە ئۆتۆمبێلەکەم؟!!!!!!

دەزانیت بەم کارەت دەبێت هەموو سەروەتی خۆشت و باوکیشت بدەیت، بۆ پڕکردنەوەی ئەو زیانەی کە بەر ئۆتۆمبێلەکەم کەوتووە؟!!!!

لەو کاتەدا تنۆك تنۆك فرمێسك لە چاوی منداڵەکە دەهاتنە خوارەوە، بە قورگێکی پڕ لە گریان و بە چاوی لە پڕ ئەسرین و بە دەنگێکی کزۆڵ و خەمبارەوە بە بازرگانەکەی گوت: (زۆر بە داخەوەم، بۆ ئەو ڕووداوە، بمبۆرە)..!!

لە ڕاستیدا من نەمدەزانی چ کارێك بکەم، لە بەیانی زووەوە لەم شوێنەدا وەستاوم، چاوەڕێم کەسێك ئاوڕم لێبداتەوە و لایەکم لێ بکاتەوە، بەڵام هیچ کەس وەڵامی نەدامەوە، تەنها کەسێکیش بە دەممەوە نەهات.. پاشان لەگەڵ هەڵوەرینی فرمێسکەکانی، ئاماژەی بۆ ئەوبەری شەقامەکەی کرد، کوڕێك لە سەر زەوییەکە کەوتبوو، پاشان بە دەم گریان و هەنیسکەوە بەرەو لای کوڕەکە ڕۆیشت و گوتی: ئەم کوڕەی لە نێو ئەم چاڵەدا کەوتووە برامە!

ئەو ناتوانێت بە ڕێگەدا بڕوات، قاچەکانی بە تەواوی لە کار کەوتوون... پاشان منداڵەکە گوتی: لەگەڵ ئەم برایەمدا، لەم ڕێگەیەوە دەڕۆیشتین، پاڵم بە کورسیەکەیەوە دەنا، لە ناکاو هاوسەنگی کورسییەکە تێکچوو، کورسییەکە لە دەستم ترازاو کەوتە ئەم چاڵەوە، منیش زۆر هەوڵمدا بەرزی بکەمەوە و بیخەمە سەر کورسییەکە، بەڵام نەمتوانی، دەستم لە زۆر ئۆتۆمبێل ڕاگرت، تا یارمەتیم بدەن، بەڵام کەس نەوەستا، براکەشم لەو چاڵەدایە، ئیدی دەبوا من چیم بکردایە، تا کەسێك ئاوڕم لێ

بداتەوە و هاوکاریم بکات؟! تەنیا ڕێگەیەك، کە بە بیرمدا هات بۆ ڕزگارکردنی براکەم ئەوەبوو، کە بەردێك بگرمە ئۆتۆمبێلێك، تا خاوەن ئۆتۆمبێلەکە لەبەر ئۆتۆمبێلەکەی خۆی ڕابوەستێ و حاڵ و گوزەرانی ئێمەش ببینێ و یارمەتیم بدات بۆ دەرهێنانی براکەم!!

خاڵە گیان ئێستا ئامادەیت یارمەتیم بدەیت، تا براکەم لەو چاڵە دەربهێنینە دەرەوە و بیخەینە سەر کورسییەکەی خۆی؟!

بازرگان بە بینینی ئەم ڕووداوە، یەکجار خەمبار بوو!!!! ماوەیەك بە سەرسامی ڕاوەستا و پاشان باوەشی بە منداڵەکەدا کرد و داوای لێبوردنی لێکرد...

ئینجا باوەشی بە منداڵە ئیفلیجەکەدا کرد و لە چاڵەکە دەریهێنا و خستییە سەر کورسییەکەی، خێرا دەستماڵی پاککەرەوەی لە ئۆتۆمبێلەکەی دەرهێنا و برینەکانی بۆ پاککردەوە، کە بە هۆی کەوتنە نێو چاڵەکەوە دووچاری هاتبوو...

پاشان منداڵەکە زۆر سوپاسی بازرگانەکەی کرد و لێی پرسی: ئێستا دەبێت من چی بکەم بۆ چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکەت؟

بازرگانەکەش، وەکو کەسێکی میهرەبان، دەستی بەسەریدا هێنا و وەڵامی دایەوە، کوڕی شیرینم خەمبار مەبە و شتێکی ئەوتۆ نییە، ئێوە خۆش بن، ئۆتۆمبێل شایەنی باسکردن نییە...

ئەوەش کە جێگەی سەرسوڕمان بوو، ئەوەبوو، کە بازرگانەکە بڕیاریدا، ئۆتۆمبێلەکەی چاك نەکاتەوە، بۆ ئەوەی هەر کات سەیری کرد، ئەو

دیمەنە دڵتەزێنەی بەبیر بێتەوە، هەروەها بۆ ئەوەش کە هیچ کەسێکی دیکە ناچار نەبێت بەردی تێبگرێت، تا ئاوڕی لێ بداتەوە....

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- ڕۆژانە لێرە و لەوێ، زۆر کەس هەن، پێویستییان بە ئاوڕدانەوەیەك هەیە، بەڵام مخابن! کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوە.
- نابێ هەڵە بە هەڵە وەڵام بدرێتەوە.
- پێویستە بەهانای ئەو کەسانەوە بچین کە پێویستییان بە کۆمەك و هاوکاری ئێمە هەیە.
- پێویستە مرۆڤ سوود لە ئەزموون و بەسەرهاتەکانی ژیان وەربگرێت.
- بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، نابێ مرۆڤ هۆکاری خراپ بگرێتە بەر.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١٢٥)

## ژنێکی دڵڕەق

کچێك دەڵێت: لە کاتی سەفەرکردنم بۆ مەککەی پیرۆز، بەمەبەستی بەجێهێنانی عەمرە، ژنێکم بینی، دانیشتبوو، زۆر بەکوڵ دەگریا و ئەوەندەی تێبینیم کرد ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەم گریانەی بەردەوام بوو!!!

منیش بەرەو ڕووی ڕۆیشتم و گوتم..دایەگیان، کەمێك ئارام بە، پاشان پرسیم: بۆچی ئاوا بە کوڵ دەگریت؟!!!

ئەویش دەستی کرد بەگێڕانەوەی چیرۆکەکەی وگوتی:(من و هاوسەرەکەم زۆر یەکتریمان خۆش دەویست، هاوسەرگیریشمان لەسەر بنەمایی خۆشەویستی بوو...بەڵام پاش تیپەڕبوونی دوو ساڵ، دەرکەوت کەمن منداڵم نابێت ...هەمیشە بە هاوسەرەکەمم دەگوت کە پێویستە ژنێکی تر بهێنیت، بەڵام ئەو ڕازی نەدەبوو.. پاش هەوڵێکی زۆر، ڕازی بوو کە ژنی دووەم بێنێ، لەو ژنە کوڕێکی بوو، بەڵام من زور ڕقم لە ژنەکە و منداڵەکەیشی بوو، چونکە هاوسەرەکەمم زۆر خۆش دەویست و زۆرگرنگیم پێ دەدا.

ڕۆژێك هاوسەرەکەم لەگەڵ ژنەکەی سەفەری کرد و منداڵەکەی لەلای من جێهێشت...درەنگانی شەو، منداڵەکە یاری دەکرد، کەش و هەواش زور

سارد بوو.....منداڵەکە بەرەو ئاگردانەکە چوو، منیش ڕامکرد، نەك بۆ ئەوەی دووری بخەمەوە، بەڵکو تا توانام بوو توند دەستیم گرت و خستمە ناو ئاگرەکەوە، بەمەش دەستی هەمووی سووتا و تائیستاش کە گەورە بووە، ئەو دەستەی تەواو نییە و شوێنەواری سووتانی پێوە دیارە!!! لەو کاتەی من دەستی ئەو منداڵەم سووتاند، تەلەفۆنم بۆکرا، کەوا هاوسەرەکەم و ژنەکەی، بە ڕووداوی هاتوچۆ مردوون....

لە پاش ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە، من ئەو منالەم گەورە کرد، زۆریشم خۆشویست و ئێستا ئەو هەموو کەسێکی منە...ئێستا من پیر بووم، ئەو من بەخێو دەکات، تەنانەت پێشم دەڵێت (دایە)!!!!!!

بەڵام هەموو کات، کە دەستە سووتاوەکەی دەبینم، دڕندەیی خۆم و بێ تاوانی ئەو منداڵەم بیر دەکەوێتەوە و دەبینم کە شەیتان چی بەمرۆڤ دەکات، بۆیە ئێستاش بەکوڵ دەگریم، بەڵکو پەروەردگارم بمبەخشێ!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- نابێ مرۆڤ ناپاکی و خیانەت لە ئەمانەت بکات.
- نابێ دڵی مرۆڤ وەك بەرد ڕەق بێت، چونکە دڵی ڕەق دوورە لە ڕەحمەتی خوا.
- مرۆڤ نازانێ خێر لە چیدایە، بۆیە باشتر وایە مرۆڤ بە قەزا و قەدەری خوا ڕازی بێت.
- نابێ مرۆڤ پەنا بۆ ستەم بەرێت، نەخاسمە دەرهەق بە کەسێك، کە هیچ تاوانێکی نەبووە و نییە.
- ئەگەر چی مرۆڤ گوناهکاریش بێت، بەڵام نابێ لە سۆز و میهرەبانی خودا بێ ئومێد بێت.

## چیرۆکی

## (١٢٦)

## دزێکی گێل

ڕۆژێـك، حەکیمێـك بەڕێگـایەکی چۆڵـدا گـوزەری دەکـرد و هەنـدێك پارەی پێ بوو، لە پڕ دزێك دەمانچەی لێ دەرهێناو پێی گوت: پارەکانتم بدەرێ، گەرنا دەتکوژم.

حەکیمەکەش پارەکەی پێدا و بەدزەکەی گوت: ئەگەر بە ژنەکەم بڵێم پـارەکەم لـێ دزراوە، بـڕوام پـێ ناکـات، تکـایە فیشـەکێك بنـێ بەکڵاوەکەمەوە، هەتا ژنەکەم بڕوام پێ بکات کەوا دز پارەکەمی بردووە!!!

دزەکەش فیشـەکێکی بەکـڵاوی حەکیمەکەوەنـا، دواتـر حەکـیمەکە گـوتی: ژنەکەم بەترسـنۆکم دەزانـێ، ئەگەر بڵـێم بەهـۆی فیشـەکێکەوە پـارەکەم تەسـلیم بـە دزەکـە کـردووە!!! تکـایە چەنـد فیشـەکێك بنـێ بە چـاکەتەکەمەوە!!! هەتـا وادەرکەوێ شـەڕێکی قورسـم لەگەڵ دزەکەدا کردووە و پاشان پارەکەم تەسلیم کردووە.

دزەکەش چەند فیشەکێکی بەچاکەتی حەکیمەکەوەنا، پاشان وەستا و گوتی: ببۆرە فیشەکم پێ نەما..!!!!

لەوکاتەدا حەکیمەکە بەتوندی دزەکەی گرت و خستییە سەر زەوی و گوتی: هەموو پارەکەمم بدەرەوە،گەرنا زۆر بەتوندی لێت دەدەم، دزەکەش ناچار بوو، هەموو پارەکە بۆ حەکیمەکە بگەڕێنێتەوە!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هەمیشە عەقڵ لە چەک بەهێزترە، بەڵام بە مەرجێك بەباشی بێتە بەکارهێنان.
- مرۆڤی ژیر و زانا، لە سەختترین کاتەکانیشدا، بەدوای ڕێگە چارەدا دەگەڕێت و تەسلیمی واقع نابێت.
- مرۆڤ دەبێ بزانێ بە چ شێوەیەك نەیاری خۆی دەخاتە تووڕی ڕاوکردنەوە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی

## (١٢٧)

## زێدە خۆشویستنی دونیا

دەوڵەمەندێك لە زانایەكی پرسی: بۆچی ئێمە هێندە دونیامان خۆش دەوێ و ڕقمان لە قیامەتە؟!!

زاناكەش وەڵامێكی پڕ پێستی خۆی دایەوە و گوتی: باشە كەس لە ماڵێكی خۆش و جوان و ئاوەدانەوە چووە بۆ ماڵێكی كاول و وێران؟!!!!

دەوڵەمەندەكەش گوتی: نەخێر.

زاناكەش گوتی: ئێوە دونیای خۆتان خۆش كردووە و قیامەتی خۆشتان وێران كردووە، بۆیە حەز ناكەن لەم شوێنە ئاوەدانە، بچن بۆ شوێنێك، كە كاول و وێران بووە!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەكانی ئەم چیرۆكە:**

- دونیا هەر چەند خۆشیش بێت، بەڵام كورت و بڕاوەیە، بۆیە نابێ مرۆڤی ژیر دونیایەكی فانی بە قیامەتێكی ئەبەدی بگۆڕێتەوە.
- مرۆڤ هەر چەند بە دەسەڵاتیش بێت، پێویستی بە زانایان و دانایان هەیە، چونكە زانایان وەك چرا وان، شەوە تاریكەكان ڕووناك دەكەنەوە.
- ئەگەر كەسێك پرس و ڕاوێژی پێكردی و لەبارەی شتێكەوە پرسیاری لێكردی، پێویستە ڕاشكاوانە وەڵامی بدەیتەوە.

# چیرۆکی

## (١٢٨)

## کاربەدەستێکی هەژار

پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب، نامەیەکی بۆ خەڵکی(حیمص) نارد و بۆی نووسین: ئەی خەڵکی حیمص، لیستی ناوی هەژارترین کەسەکانی شاری حیمصم بۆ بنێرن، تاکو لە زەکاتی کۆکراوە بەشیان بنێرین!

کە لیستەکە گەیشتە دەستی، بینی ناوی (سەعدی کوڕی عامر)ی والی(پارێزگار)ی شاری(حیمص)یشی تێدایە!!!!

پێشەوا عومەر تووشی شۆك بوو!!!! خۆی بەرەو حیمص کەوتە ڕێ.

ئینجا هەم والی، هەمیش خەڵکی(حیمص)ی بانگ کرد و لە خەڵکەکەی پرسی: چ ڕەخنەیەکتان لە والی هەیە؟

خەڵکەکە گوتیان، ئێمە سەعدی کوڕی عامرمان زۆر بە دڵە و کەسێکی دادپەروەرە، بەڵام تەنها سێ عەیبی هەیە!!!!

- یەکەم: هەتا نیوەڕۆ نایەتە دەرەوە و نایەتە ناومان!
- دووەم: بە شەواندا دیار نامێنێ!
- سێیەم: هەفتەی یەک ڕۆژ دیار نامێنێ!

پێشەوا بە سەرسامییەوە ڕووی کردە سەعد و گوتی:

ئا دەی وەڵامت چییە بۆ ئەم ڕەخنانە؟

سەعدی کوڕی عامر دەستی بە قسە کرد وگوتی:

* ئەی ئەمیری باوەڕداران: لەبارەی ڕەخنەی یەکەم، کە هەموو ڕۆژێ تا نیوەڕۆ ناتوانم بڕۆمە دەرەوە، لەبەر ئەوەیە چونکە ئەرکەکانی ماڵەوە جێبەجێ دەکەم، لەبەر ئەوەی خێزانەکەم نەخۆشە و منیش خزمەتکارم نییە !

* لەبارەی ڕەخنەی دووەم، کە بەشەو نامبینن، چونکە من ڕۆژەکانم تەرخان کردووە بۆ خزمەتی ئەوان، بەڵام شەوەکانیشم تەرخانکردووە بۆ خواپەرستی!

* لەبارەی ڕەخنەی سێیەم، کە هەفتەی ڕۆژێک دیار نامێنم، لەبەر ئەوەیە کە من تەنیا ئەم دەستە جلەم هەیە، بۆیە ئەو ڕۆژەی کە دەیشۆم، دەبێ چاوەڕێ بکەم تا وشک دەبێتەوە، بۆیە ناتوانم دەربچم!!!!

پێشەوا عومەر، کە ئەم وتانەی گوێ لێ بوو، دەستی بە گریان کرد!!!!!

پێش ئەوەی حیمصیش جێبهێڵێ، ئەو زەکاتەی دابەش کرد بە سەریاندا، کە بۆ هەژارەکانی هێنابوو، بەشی سەعدی کوڕی عامریشی دا، وەک یەکێ لە هەژارەکانی ئەو شارە!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- کاربەدەست بە خاکەڕایی لە ناو قەوم و هۆزەکەیدا گەورە دەبێت.
- پێویستە ژیانی مرۆڤی کاربەدەست وەك ژیانی قەومەکەی بێت، بۆ ئەوەی بتوانێ خۆشەویستی خۆی لە ناو دڵیاندا بچێنێت.
- نابێ مرۆڤ بە پلە و پایە لەخۆبایی ببێت، چونکە وەرگرتنی بەرپرسیارەتی، ئەرکە نەك فەزیلەت!!!!
- مرۆڤ بە خزمەتکردن، لە چاوی ماڵ و منداڵ و گەلەکەیدا گەورە دەبێت.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

# چیرۆکی

## (١٢٩)

## یاسای کێشکردن

زانـای بەناوبانـگ" نیوتــن"، کە دۆزرەوەی یاسـای کێشـکردنی زەوی بوو، لە ئاهەنگێکدا، لەگەڵ ژنێك کەوتە قسە و گفتوگۆکردن.

ژنەکە لێـی پرسـی: ئەی زانـای بەناوبانـگ، پـێم بڵـێ، چـۆن ئەو داهێنانەت کرد و یاسای کێشکردنی زەویت دۆزییەوە؟

نیوتن گوتی: بەهۆی بیرکردنەوەوە! من ڕۆژانە بەشێکی کاتم تەرخان دەکرد، هەتا بزانم چی وا لەو شتانە دەکات کەوا بکەونە سەر زەوی! تەنیا بیرکردنەوە بووە هۆی ئەوەی من ئەو یاسایە بدۆزمەوە.

ژنەکە گوتی: بەڵام من ڕۆژانە چەند کاتژمێرێك بیردەکەمەوە، کەچی هیچم نەدۆزیەوەتەوە!!!!

نیوتن: ڕۆژانە بیر لەچی دەکەیتەوە؟

ژنەکە: بیر لە مێردەکەم دەکەمەوە، کە دەریکردووم و تەڵاقی داوم ؟!!!!

نیوتن: ئایا کەی بیرت لە مێردەکەت کردۆتەوە، پێش تەڵاق دان، یان دوای

تەڵاق؟

ژنەکە: بەدڵنیاییەوە، دوای تەڵاق دا!!!

لێرەدا نیوتن گوتی:" ئەگەر پێش تەڵاق دان بیرت لە مێردەکەت بکردایەتەوە، تۆش دەتتوانی یاسای کێشکردن لە جۆرێکی دیکەدا بدۆزیتەوە، کە بریتییە لە خۆشەویستی"!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- خۆپاراستن لە چارەسەر باشترە!
- پێویستە مرۆڤ بەشێك نەبێت لە کێشە، بەڵکو هەمیشە بەشێك بێت لە چارەسەر.
- خۆشەویستی هەوێنی ژیانە، بەبێ خۆشەویستی، ژیان دەبێتە ژان.
- مرۆڤی ژیر بیر لە ڕابردوو ناکاتەوە، بەڵکو بیر لە ئێستا دەکاتەوە، چونکە وتراوە: ڕابردوو ناگەڕێتەوە، ئایندەش نەهاتووە، کەواتە بیر لە ئێستا بکەرەوە و بۆ ئێستا بژی!
- پێویستە ژن و مێرد لە ژیانی هاوسەرگیریدا، سیفەتی مۆگناتیسییان هەبێت و بتوانن یەکتری ڕاکێشن.
- ..................................
- ................................
- ................................

## چیرۆکی

## (١٣٠)

## باشترین و خراپترین پارچە گۆشت

یەکێك لە کاربەدەستەکان، زانا و حەکیمێکی تاقیکردەوە، بۆیە ڕۆژێك پێی گوت: بڕۆ بازاڕ، باشترین گۆشتم بۆ بێنە!!

ئەویش دەچێتە بازاڕ، دڵ و زمانی ئاژەڵێك دەکڕێ و دەگەڕێتەوە لای کاربەدەستەکە و پێی دەڵێت: فەرموو قوربان، ئەم دوو پاچە گۆشتە لە هەموو گۆشتێك باشترن!!!

ئینجا ڕۆژی پاشتر، دیسان داوای لێدەکاتەوە کە بچێتەوە بازار و خراپترین گۆشتی بۆ بێنێت!!!

ئەویش دەچێتەوە بازاڕ و وەك جاری پێشتر، دڵ و زمانی ئاژەڵێکی دیکە دەکڕێ و دەگەڕێتەوە لای کاربەدەستەکە و پێی دەڵێت: فەرموو قوربان، ئەم دوو پاچە گۆشتە لە هەموو گۆشتێك خراپترن!!!

کاربەدەستەکەش لەو کارەی ئەو زانایە سەری سوڕدەمێنێ و لێی دەپرسێ: دوو جار داوام لێکردی کە باشترین و خراپترین گۆشتم بۆ بێنیت، کەچی لە هەر دوو جارەکە، هەر دڵ و زمانت بۆ هێنام؟!!!!! نازانم حیکمەتەکەی چییە؟

ئەویش دەڵێ: قوربان، ئەگەر دڵ و زمان باش بوون، هەموو پارچەکانی دیکەی ناو جەستە باش دەبن، بەڵام ئەگەر خراپ بوون، هەموو پارچەکانی دیکەی ناو جەستە خراپ دەبن...!!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- دڵ و زمان گرنگترین ئەندامی لەشن، بۆیە ئەگەر ئەوان ڕاست و پاك بوون، جەستەش پاك دەبێت، بەڵام ئەگەر ئەوان کەچ و خوار بوون، ئەوا جەستەش بەلارێدا دەبەن.
- پێویستە مرۆڤ هەمیشە زانیاری لە کەسانی زانا و دانا و حەکیم وگەڕیدە و دونیا دیدە وەربگرێت، چونکە ئەزموونێکی زۆریان هەیە و هەگبەیان پڕە لە زانست و زانیاری.
- سەرچاوەی زۆربەی کێشە و گرفتەکانی مرۆڤ، دڵپیسی و زمان ڕەشییە!!!!!
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆكی

## (١٣١)

## سێوی شیرین

لە هەر دەستێكی منداڵەكەدا، سێوێك هەبوو!!!!

كاتێك دایكی داوای سێوێكی لێكرد، ئەو خێرا گازێكی لە هەر یەك لەدوو سێوەكە گرت!!!

دایكی ئەم ڕەفتارە خۆویستەی كچەكەی زۆر پێ ناخۆش بوو!!! بۆیە جێیهێشت و ڕۆیشت!!!

كچەكەی گوتی: دایە گیان فەرموو، ویستم تاقییان بكەمەوە و خۆشترینیان بدەم بە تۆ!!!!

ئەمیان شیرینەكەیە، ها...بۆ تۆ!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ نەك بە سێوێك، بەڵکو بە هەموو ماڵی دونیا ناتوانێ قەرزەکانی دایکی خۆی بداتەوە.
- پێویستە مرۆڤ بەرامبەر بە دایکی خۆی وەفادار بێت و ڕابردووی خۆی بیر نەچێتەوە.
- دایك هەمیشە چاوی لە منداڵە، کە بەشێك لە قەرزەکەی بداتەوە و لەگەڵی چاك و باش بێت.
- بەهەشت لە ژێر پێی دایکان دایە، بۆیە دەرفەتێکی زێڕین لەبەردەستی ئەو کەسانەدایە کە دایکیان لە ژیاندا ماوە، بۆ ئەوەی لەو دەرگایەڕا بچنە بەهەشتێ.
- دایك شایستەی جوانترین دیاری و خەڵاتە.
- نابێ مرۆڤ گومانی خراپ بە کەس ببات.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆكی

## (١٣٢)

# پەتی درۆ كورتە

جەنابی بەڕێوەبەر، ویستی وا لە دەوروبەری بگەیەنێت، كە ئەو گەورەیە و هەمیشە لەگەڵ پیاوی گەورەدا قسە دەكات!!!!

بۆیە كە یەكێك هاتە ژوورەكەیەوە، ئەم فەرمووی لێكرد و داینیشاند و پێی گوت: تكایە چەند خولەكێك دابنیشە، تا ئەم پەیوەندییە گرنگە ئەنجام دەدەم!!!!

دەسكی تەلەفۆنەكەی هەڵگرت و دەستیكرد بەقسەی گەورە و وای پیشاندا، كە لەگەڵ كەسێكی زۆر گەورەدا قسە دەكات!!!

پاش تەواوكردنی قسەكانی بە میوانەكەی گوت: فەرموو با بزانم كارێكت هەبوو؟

میوانەكە گوتی: قوربان من كارمەندی بەدالەم، ئەو تەلەفۆنەتان ئیش ناكات، هاتووم چاكی بكەمەوە!!!!!

بەم قسەیەش، ڕیسی بەڕێوەبەرە خۆهەڵكێشەكە كردەوە بە خوری!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- پەتی درۆ کورتە، بۆیە وتراوە: درۆزن تەنیا جارێک دەتوانێ خەڵك هەڵخەڵەتێنێت، بەڵام ناتوانێ تاسەر خەڵك هەڵخەڵەتێنێت.
- نابێ مرۆڤ بە پلە و پایە و پۆست، یان پارە و پووڵ، خۆی هەڵبکێشێت و لەخۆبایی ببێت.
- مرۆڤی بەرپرس، دەبێ خاکەڕا(متواضع)بێت و خزمەتکاری خەڵك بێت، چونکە مرۆڤی خاکەڕا، لە چاوی خەڵکداگەورەیە، بەڵام مرۆڤی لەخۆبایی، لە چاوی خەڵکدا سووك و بچووکە.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١٣٣)

## فەردەی پیاز!

ڕۆژێک حەکیمێک بە کوڕەکەی گوت: لە بەیانییەوە فەردەیەک لەگەڵ خۆت بهێنە و ڕقت لە چەند کەس دەبێتەوە ئەوەندە پیازە بخەرە ناو فەردەکەتەوە!

ڕۆژی دواتر، کوڕەکەی ئەو کارەی کرد و حەکیمی زانا پێی گوت: بۆ هەر جێگایەک کە دەڕۆی، ئەو فەردەیە لەگەڵ خۆت ببە!!!

کوڕە دوای چەند ڕۆژێک ماندوو بوو، هاتە لای حەکیمی باوکی وگوتی: پیازەکان بۆگەن بوونە، بۆنێکی زۆر ناخۆشی لێ دێت، منیشی بێزار کردووە!!

حەکیمیش گوتی: ئەمە نمونەی ئەو جۆرەیە کە تۆ ڕق و کینەی کەسانێک لە دڵ هەڵگری، دڵ و دەروونت پیس دەکات و لە هەمووان زیاتر خۆت ئازار دەچێژی...

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤی قین لە دڵ، لە هەموو کەسێك زیاتر ئازار دەچێژێت، بۆیە ئەگەر هەر کەسێ بیەوێ ئاسوودە بێت، دەبێ کەسانی دیکە ئاسوودە بکات.
- تەمەن هێندە درێژ نییە، کەوا مرۆڤ دڵی خەڵك لە خۆی بڕەنجێنێت.
- مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە کە زۆرترین دۆست و کەمترین دوژمنی هەبێت.
- ..........................................
- ..........................................
- ..........................................

## چیرۆکی

## (١٣٤)

## بەسەرهاتی پرتەقال فرۆش و پیرەژنەکە

عارەبانچییەك، لەسەر جادە پرتەقالی دەفرۆشت! پیرەژنێك بەوێدا هات! لە کابرای پرسی: ئەم پرتەقالانە ترشن یان شیرینن!

کابرا وا گومانی برد کەوا ئەو پیرەژنە پرتەقالی ترش ناخوات، بۆیە پێی گوت: پرتەقالەکانم شیرینن!!!!

پیرەژنەکە گوتی:من پرتەقالی شیرینم ناوێ، ویستم بۆ بووکەکەم بکڕم، چونکە دووگیانە و حەزی لە پرتەقالی ترشە!!!!

کابرا بەو درۆیە، کڕیارێکی لە دەست دا، بەڵام پەندی لێ وەرنەگرت!!!!

دوای دوو ڕۆژ، ژنێکی دووگیان، بەلایدا تێپەڕی، لێی پرسی: پرتەقالەکانت ترشن یان شیرینن؟!!!

کابرا، لە دڵی خۆیدا گوتی: مسۆگەر ئەم ژنە دووگیانە حەزی لە پرتەقالی ترشە، چونکە قسەی پیرەژنەکەی بیرکەوتەوە!!!

بۆیە بە خانمەکەی گوت: پرتەقالەکانم ترشن، چەند کیلۆت دەوێ!!!!

ژنەکە گوتی: ببۆرە، من بۆ خەسووم هاتووم پرتەقالی شیرین بکڕم، چونکە ئەو حەزی لە پرتەقالی شیرینە!!!!

کابرای پرتەقاڵ فرۆش، پەنجەی خۆی گەست و زانی ئەم ژنە، بووکی ئەو پیرە ژنە بووە، کە دوو ڕۆژ پێش داوای پرتەقاڵی کردبوو!!!!
بەم درۆکردنە، هەردوو جارەکە، هەردوو کڕیارەکەی خۆی لەدەست دا..!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- دەبێ فرۆشیار، لە کێشان و پێوان و کڕین و فرۆشتندا ڕاست و دروست بێت، بۆ ئەوەی بەرەکەت بکەوێتە ماڵەکەیەوە.
- ئەوەی چاڵ بۆ کەسێك هەڵبکەنێت، مسۆگەر خۆی دەکەوێتە ناوی.
- پێویستە مرۆڤ پەند لە هەڵەکانی خۆی وەربگرێت.
- نابێ مرۆڤ چاوی لە ماڵی حەرام بێت.
- فرۆشیاری درۆزن، زوو یان درەنگ، متمانەی خۆی لەدەست دەدات، چونکە پەتی درۆ کورتە.
- ..........................................
- ..........................................
- ..........................................

## چیرۆکی

## (١٣٥)

## وانەیەکی گرنگ

کوڕێـك، باوکـە بەتەمەنەکـەی خـۆی بـۆ نـانی ئێـوارە بـرد بـۆ ڕیستۆرانتێك.

بـاوکی زۆر پیـر و بێهێـز بـوو بـوو، لـەکاتی نـانخواردن، خـواردنی ڕشت بەسەر بلۆز و پانتۆڵەکەیدا.

میوانـەکانی تـر، بـە قێـزەوە سـەیرییـان دەکـرد، لـە کاتێکـدا کوڕەکـەی لەسەرخۆ بوو.

کاتێـك نانەکـەی تـەواو کـرد، بـەهۆی بێسـەروبەری باوکییـەوە، هەسـتی بـە شەرمەزاری نەکرد!! بەڵکو هەستا دەستی بـاوکی گرت و بردی بۆ دەست شـۆرەکە و پیسـییەکەی سـەر جلـەکانی لابـرد و قژیشـی بـۆ شـانە کـرد و چاویلکەکەیشی بەجوانی بۆ کردە چاوی!!!!

کاتێـك ویسـتیان بـڕۆن، خـەڵکی نـاو ڕیسـتۆرانتەکە بـە بێدەنگییەکـەی زۆرەوە سەیری ئەو باوك و کوڕەی دەکرد.

کوڕەکـەی چـوو پارەکـەی داو لەگـەڵ بـاوکی، خـەریك بـوو بـەرەو دەرەوە دەڕۆیشتن!!!

لەو کاتەدا، پیاوێکی بەتەمەن لەناو میوانەکاندا گازی کوڕەکەی کرد و لێی پرسی: (پێت وانییە شتێکت لە دواوە بەجێهێشتبێت)؟!!

کوڕەکەش گوتی: "نا، بەڕێزم، هیچم بەجێنەهێشتووە."

پیاوە بەتەمەنەکە خێرا وەڵامی دایەوە و گوتی: "با، بەجێتهێشتووە! تۆ وانەیەکت بۆ هەموو کوڕێک و هیوایەکت بۆ هەموو باوکێک بەجێهێشتووە"!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- دەبێ ڕێز لە کەسانی پیر و بە تەمەن بگرین، بەتایبەتی دایک و باوک.
- خزمەتکردن بە دایک و باوک، هەم ئەرکە، هەمیش فەزیلەتە، چونکە مرۆڤ بە خزمەتکردن مەزن دەبێت.
- چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک وەک قەرز وایە، دەبێ بیدەینەوە، ئەگەر نا، لە کاتی پیری، باجەکەی دەدەینەوە و منداڵەکانمان، تۆڵەمان لێ دەکەنەوە!!!
- مرۆڤی ڕەسەن و خاوەن کەسایەتی، نابێ خۆی بگۆڕێت و بە هەموو ئاوازێك هەڵبەڕێت و خۆی و ڕابردووی خۆی بیرچێتەوە!!!!
- ..............................................
- ..............................................
- ..............................................

## چیرۆکی

## (١٣٦)

## وانەی مامۆستایەک بۆ گەنجێکی هەرزەکار

گەنجێکی بێکاری هەرزەکاری سەرەڕۆی بێڕێز، بەلای پەنجەرەی قوتابخانەی گوندەکەیان تێپەڕی، بینی مامۆستا خەریکی گوتنەوەی وانەی (ڕەوشت)ە، بە قوتابییەکانی، سەری لە پەنجەرەکە بردە ژوورەوە، بۆ ئەوەی گاڵتە بە مامۆستایەکە بکات! بە توانجەوە بە مامۆستاکەی گوت: مامۆستا خەڵك گەیشتە سەر مانگ، تۆ هێشتا خەریکی وانەی ئەدەب و ڕەوشتبەرزی بە قوتابییەکانت دەڵێیتەوە!!

مامۆستاکەش سەیری قوتابییەکانی کرد و بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشت، لەبەردەم قوتابییەکاندا بە گەنجەکەی گوت: کوڕەکەم، تۆ نەگەیشتیتە سەر مانگ!!

نە فێری ئەدەبیش بوویت!!!!

گەنجەکەش وەك هەمووجار سەری شۆڕ کرد و ڕۆیشت.

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- زانست بەبێ ڕەوشت، وەك جەستەی بێ گیان وایە و هیچ سوودێکی ئەوتۆی نییە.
- مرۆڤ چەندە زانا و دانا بێت، نابێ لەخۆبایی بێت و سووکایەتی بە کەسانی دیکە بکات.
- ڕەوشت بەردی بناغەی دروستبوونی کۆمەڵگەیەکی بەختەوەر و تێگەیشتوو و پێگەیشتوو و پێشکەوتوو و سەرکەوتووە.
- ڕەوشت و زانست وەك دوو باڵ وان، مرۆڤ بەهۆی ئەو دوو باڵەوە دەتوانێ بەرەو بەرزی بفڕێ و بگاتە لووتکەی خۆشی و بەختەوەری و پێشکەوتن و سەرکەوتن و تێگەیشتن و پێگەیشتن و زانایی و دانایی.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١٣٧)

## بەخشندەیی

پیاوێك و ژنێك هاتنە كافتریاكە، داوایان لە گارسۆنەكە كرد سێ قاوەیان بۆ بێنێ... گارسۆن دوو قاوەی بۆ هێنان، كاتێ هەستان و ڕۆیشتن پارەی سێ قاوەیان دا و شتێكیان گوت!

دوو پیاو هاتنە ژوورەوە و داوای چوار نیسكافەیان كرد، گارسۆن دوو نیسكافەی بۆ هێنان... كاتێ ڕۆیشتن پارەی چوار نیسكافەیان دا و شتێكیان گوت!

چوار كچ هاتن و داوای پێنج قاوەیان كرد، گارسۆن چوار قاوەی بۆ هێنان... كاتێ ڕۆیشتن، ئەمانیش پارەی پێنج قاوەیان دا و شتێكیان گوت!

گارسۆنەكە سەری سوڕما!! چونكە كارمەندێكی نوێ بوو و لە نهێنی ئەو كارەی نەدەزانی ئاخۆ هەندێ لەو كەسانەی كە دەهاتنە كافتریاكە بۆچی پارەی زیاتر دەدەن؟!!! بۆیە هەستا چوو بۆ لای خاوەنی كافتریاكە و لێی پرسی: بەڕاست ئەمە چییە، سێ قاوەیان خواردووتەوە، كەچی پارەی چوار دەدەن و بە چپە و سرتە، قسەیەك دەكەن؟!!!

خاوەنی كافتریاكە گوتی: ئەمە نەریتێكی شارەكەمانە.

ئەوەی لە دەستی بێت پارەی زیاتر دەدات، لەبری ئەو کەسانەی کە دێنە کافتریاکە و پارەیان نییە، یان پارەیان پێ نییە، لەم حاڵەتەدا، بەخشندە و پێ بەخشراو یەکتر ناناسن و بە ڕوویاندا نادرێتەوە!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- هاوکاریکردنی هەژاران و نەدارن، کرۆکی مرۆڤدۆستی و ویژدان زیندووییە!!!
- بەخشین، بە کەم مەزانە، ئەگەر شتێکی کەمیش بێت، چونکە زۆر کەس هەیە بەو شتە کەمە، دەتوانێ لەسەر قاچەکانی خۆی بوەستێت و بەشێك لە پێداویستییەکانی خۆی دابین بکات.
- کاتێ مرۆڤ خێر و سەدەقەیەك دەکات، تا پێی بکرێت بە نهێنی بیکات، بۆ ئەوەی دوور بێت لە ڕووپامایی و ڕیا و خۆهەڵکێشان!!!
- کاکی دەوڵەمەند و سەرمایەدار! قەت وا مەزانە گیرفانی خەڵکی دیکە، وەك گیرفانی تۆ پڕە، بۆیە نەکەی هەژار و نەدارەکان لەبیر بکەیت!!
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١٣٨)

## باوکێکی بێکەس

باوکێکی پیر و بێکەس، مۆبایلەکەی بردە لای وەستای مۆبایل، دوای ماوەیەك، وەستای مۆبایل بەو پیاوە پیرەی گوت: مامەگیان مۆبایلەکەت هیچ عەیبێکی نەبوو، بۆچی هێنابووت بۆ لای من؟!!!!

باوکە بەتەمەنەکەش گوتی: ئەی بۆچی هیچ یەك لە منداڵەکانم، زەنگم بۆ لێنادەن؟!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

● دایك و باوك، کە چوونە تەمەنی پیرییەوە، زیاتر پێویستییان بە سۆز و خۆشەویستی منداڵەکانیان هەیە.

●منداڵ نابێ بەرامبەر بە دایك و باوکی بێ وەفا و ئەمەك بێت و ڕابردووی خۆی لە بیر بکات.

● چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك و بەسەرکردنەوەیان، ئەرکێکی ئەخلاقی و ئایینی و کۆمەڵایەتییە.

●نابێ بە هیچ پاساوێك، منداڵ پشت لە دایك و باوکی بکات و فەرامۆشیان بکات.

●.................................................

## چیرۆکی

(١٣٩)

## باشترین خەڵات

کچەکە بە تەنیشت پیاوە فەقیرەکەدا ڕۆیشت، ویستی چاکەیەکی بەرانبەر بکات، دەستی کردە ناو جانتاکەی، بینی جزدانی بیر چووە!

دانەوی و بە فەقیرەکەی گوت: ببۆرە باوکە! پارەکانم لە ماڵەوە لەبیر چووە!

ئینشائەڵڵا بە زووترین کات دەگەڕێمەوە و پارەت بۆ دێنم.

هەژارەکە جوابی دایەوە گوتی: پێویست ناکات کچەکەم، تۆ شتێکت پێ بەخشیم، هیچ کەس پێی نەبەخشیوم!

کچەکە گوتی: بەڵام باوکە من هیچم پێت نەبەخشیوە!

هەژارەکە: تۆ کە گوتت ببۆرە باوکە! هەموو شتێکت بە من بەخشی، ئەو وشەی باوکەیە لە کەسی دیکەم گوێ لێ نەبووە!

ئەوە باشترین و خۆشترین وشەیە لای من!!!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- ڕێزگرتن، باشترین دیاری و خەڵاتە، کە مرۆڤ بە ئەوانی دیکەی ببەخشێت.
- هەموو کەسێك پێویستی بە ڕیزگرتن هەیە، بەتایبەتی هەژارەکان، بۆ ئەوەی هەست بە خۆبەکەمزانین نەکەن و تەرق نەبنەوە.
- مرۆڤە بەتەمەنەکان چاویان لەوەیە، کەوا گەنج و منداڵەکان ڕێزیان لێبگرن.
- ..................................................
- ..................................................
- ..................................................

## چیرۆکی

## (١٤٠)

## دەستپاکی

پیاوێکی سوالکەری ئەمریکی، بەناوی(گلین جەیمس)، لە یەکێك لە شەقامەکانی کالیفۆڕنیای ئەمریکا، بەناو زبڵەکاندا بۆ خواردن دەگەڕا، جانتایەکی دۆزییەوە، کە لە نزیك دیوارێك کەوتبوو،کاتێك جانتاکەی کردەوە، بینی بڕی(٤٠/٠٠٠) چڵ هەزار دۆلاری تێدایە.

هەر چەندە ئەو پیاوە هەژار و دەستکورت بوو، بەڵام چاوی لەو پارەیە نەبوو، چونکە دەیزانی هی خەڵکە! بۆیە خێرا خۆی گەیاندە بنکەیەکی پۆلیس و جانتاکەی دایە دەستیان، دوای ئەو هەڵوێستە جوانە، حکومەت بانگەشەیەکی خێرخوازی بۆ ئەنجامدا و توانرا بڕی(٨٥/٠٠٠) هەشتا هەزار دۆلاری ئەمریکی بۆ کۆبکەنەوە، واتە زیاتر لە دوو هێندەی ئەو پارەیەی لە ناو جانتاکەدا دۆزیبووە.

ئەم کابرایە، مرۆڤێکی دەست و دڵپاك بوو، بۆیە، خوا دەرگایەکی بەڕوویدا کردەوە و ئەوەی کە چاندی، هەر زوو بەرهەمەکەی چنییەوە!!!!

**پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەم چیرۆکە:**

- مرۆڤ چی بچێنێت، ئەوە دەدورێتەوە.
- دەستپاکی سیفەتێکی بەرزە، تەنیا لە کەسانێکدا بەرجەستە دەبێت، کە قەدری ئەو سیفەتە بزانن.
- مرۆڤ بەهۆی دەستپاکییەوە دەتوانێ ببێتە خۆشەویستی خەڵك.
- مرۆڤی دەستپاك، هەمیشە جێی متمانەیە لە ناو خەڵکدا.
- نابێ مرۆڤ چاوی لە ماڵی حەرام بێت، ئەگەر چی هەژار و دەستکورتیش بێت.
- ..........................................................
- ..........................................................
- ..........................................................

## سەرچاوەکان

بۆ ئامادەکردن و کۆکردنەوەی چیرۆکەکانی بەرگی دووەمی ئەم کتێبە، سوودم لەم کتێب و ماڵپەڕانە وەرگرتووە:

- کتێبی(قصص علمتنی الحیاة)، بە(PDF)، اعداد محسن جبار، بەشی یەکەم و دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم.
- کتێبی(١٠٠)داستان کوتاه تاثیرگذار، بە(PDF).
- ماڵپەڕی مامۆستا عبدالرحمن صدیق
- ماڵپەڕی مامۆستا حسێن گردەچاڵی
- ماڵپەڕی کورتە چیرۆك
- ماڵپەڕی سانا
- ماڵپەڕی چیرۆکی کارگێڕی
- وتارەکانی مامۆستا جەمال کۆچەر

سەرەڕای ماڵپەڕە کوردییەکان، سوودێکی زۆرم لە ماڵپەڕە(فارسی) و (عەرەبی)یەکانیش وەرگرتووە و چەندین چیرۆکم لە(فارسی) و (عەرەبی)ییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی و بۆ یەکەم جار لەم پەرتووکەدا بڵاوکراونەتەوە .

**پەرتووکە چاپکراوەکانی نووسەر**

١. فەرهەنگی کانی (کوردی-کوردی).
٢. هونەرێ پەیڤینێ(چەوا جوان باخڤین)؟
٣. ٢٠٠٠پەند ژ جیهانێ.
٤. هونەرێ نڤیسینێ(چەوا باش بنڤیسین)؟
٥. دەروونناسیا زارۆکان(دەروونزانی).
٦.گەریان ل دیڤ بەختەوەریێ.
٧. پەیوەندی دناڤبەرا مامۆستای و قوتابیدا.
٨. کلیلەکانی سەرکەوتن.
٩. کێشە ئاکاری و دەروونییەکانی منداڵ(سۆرانی).
١٠. ئاریشین ئاکاری و دەروونییێن زارۆکی(بادینی).
١١. رەوشەنبیر کییە؟
١٢. خەزینا زانستی- بەرگێ یەکێ.
١٣.خەزینا زانستی - بەرگێ دووێ.
١٤. مامۆستای باش و سەرکەوتوو کێیە؟ (سۆرانی).
١٥. مامۆستایێ باش و سەرکەفتی کییە؟ (بادینی).
١٦. رۆژنامەنووسی پرۆفیشناڵ و ئیتیکی رۆژنامەوانی.
١٧. هونەری خوێندنەوە، ١٤٠ کلیل بۆ سەرکەوتنی قوتابی لە قوتابخانەدا(سۆرانی).
١٨. ١٤٠کلیل بۆ سەرکەفتنا قوتابی ل قوتابخانێ(بادینی).
١٩. خاڵخاڵۆك (هەڵبەستی منداڵان).
٢٠. کارگێریی قوتابخانە و بەرێوەبەری سەرکەوتوو(سۆرانی).
٢١. کارگێریا قوتابخانێ و رێڤەبەرێ سەرکەفتی(بادینی).
٢٢. بنەما و ئادابەکانی دان وستاندن(سۆرانی).
٢٣. هونەرێ دان وستاندنێ (چەوا جوان دان و ستاندنێ بکەین)؟
٢٤ .حەفت سەیر و سەمەرەکانی جیهان.
٢٥.فەرهەنگی رسەن(بەرگی یەکەم).
٢٦.فەرهەنگی رسەن(بەرگی دووەم).
٢٧. قەیرانی کەم خوێندنەوە لە کوردستان.
٢٨. رۆڵی خێزان و قوتابخانە لە ریشەکێشکردنی توندوتیژیدا،(سۆرانی).

٢٩. رۆلێ مالباتێ و قوتابخانێ د بنەبڕکرنا توندوتیژییێدا،(بادینی).
٣٠. پەندێن ژیانێ ژگۆتنێن زانا و ناڤدارێن جیهانێ
٣١. ئەڵند،(١٠٠) سروود و هۆزانێن زارۆکان (شیعری منداڵان).
٣٢. رێبەرێ هشیارکرنێ ژ مەترسیێن مین و تەقەمەنییا
٣٣. سەرهاتییا هرچێ و جۆتیاری(چیرۆکە شیعر).
٣٤. رێبەری قوتابخانەی هاورێی منداڵ لە هەرێمی کوردستان(سۆرانی).
٣٥. سپاردە چییە؟
٣٦. پەروەردە وفێرکردنی منداڵ لە ئیسلامدا(سۆرانی).
٣٧. پەروەردە و فێرکرنا زارۆکی دئیسلامێدا(بادینی).
٣٨. ستەم لە تەرازووی ئیسلامدا.
٣٩.رۆڵی خێزان و قوتابخانە لە پەروەردە و فێرکردنی قوتابیدا، (سۆرانی).
٤٠.رۆلێ مالباتێ و قوتابخانێ دپەروەردە و فێرکرنا قوتابیدا، (بادینی).
٤١. رێبەرا قوتابخانا دۆستا زارۆکی ل هەرێما کوردستانێ(بادینی).
٤٢. هەڵە باوەکانی دایکان و باوکان بەرامبەر بە منداڵەکانیان، بەرگی یەکەم، محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٦.
٤٣. هەڵە باوەکانی دایکان و باوکان بەرامبەر بە منداڵەکانیان، بەرگی یەکەم، محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٦.
٤٤. چیرۆکە کاریگەرەکانی ژیان، بەرگی یەکەم، ئامادەکردن و کۆکردنەوەی محەمەدساڵح پێندرۆیی(جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٧.
٤٥. وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ، نووسینی محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٧.
٤٦. فەرهەنگی پەیڤ، کوردی (ژووروو- کوردی ناوەڕاست- لاتینی) بەرگی یەکەم، محەمەدساڵح پێندرۆیی(جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٧.
٤٧. فەرهەنگی پەیڤ، کوردی (ناوەڕاست- کوردی ژووروو- لاتینی) بەرگی دووەم، محەمەدساڵح پێندرۆیی(جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٧.
٤٨. چیرۆکە کاریگەرەکانی ژیان، بەرگی دووەم، ئامادەکردن و کۆکردنەوەی محەمەدساڵح پێندرۆیی(جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٧.